پەیڤێک

لەووتارەکانی مامۆستا شێرزاد

# بایەند وەربگرین لە ٢٩ چیرۆکی راستەقینە



نووسینەوەی
دەستەیەک لەخوشکان

یەکەم چاپ
هەولێر
٢٠١٠

## ناسنامەی کتێب

ناوی پەرتووك:با پەند وەرگرین لە (٢٩)چیرۆکی راستەقینەدا (لەوتارەکانی مامۆستا شێرزاد)
بابەت : کۆمەلایەتی
نوسینەوەی : دەستەیەك لەخوشکان
کۆمپیوتەر: نووسینگەی هیوا
چاپی : یەکەم ٢٠١٠
شوێنی بلاوکردنەوە: ((کتێبخانەی حاجی قادری کۆیی))

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانەی گشتییەکان ژمارە سپاردنی (١٢٤٧) ی ساڵی ٢٠٠٩ ی پێدراوە

بلاوکراوەی کتێبخانەی
حاجی قادری کویی
بو فروشتن و چاپکردن و بلاوکردنەوە
هەولێر کوردستان عیراق
٠٧٥٠ ٤٦٧ ١٣ ٩٤ ☎ - ٠٦٦ ٢٢ ٢٣ ٨٦٨

# با پەند وەرگرین
# لە (٢٩) چیرۆکی ڕاستەقینەدا

لەوتارەکانی مامۆستا شێرزاد

نوسینەوەی

دەستەیەك لەخوشکان

چاپی یەکەم

هەولێر ٢٠١٠

## بسم الله الرحمن الرحيم

**الحمد لله رب العالمين. الصلاة والسلام على حبيبنا محمد (ﷺ)وعلى اله وصحبة اجمعين. السلام عليكم ورحمة الله وبركاته.**

خۆشەویستانو ئازیزانم خۆشحالم بەخزمەتتان گەیشتم و ڕەمەزانتان لیّ پیرۆز ئەکەم، لەخوای میهرەبان داواکارم ئەم ڕەمەزانە پڕ لە بەرەکەت و خۆشی و زەردە خەنەی سەر لێوانتان بێت، لەخوای گەورە ئەپاڕێمەوە ئەم ڕەمەزانەتان قبوولّ بکات و تاعەت و عیبادەتی ڕەمەزانتان قبوولّ بکات و سەرکەوتنی موسڵمانان بێت ڕۆژی ڕەشی کافران و دووڕووان بێت.

خوایە گیان دەفتەری کردەوەکانمان سپی بکەیت لەم ڕەمەزانە پیرۆزەدا وەبە بەهەشتی بەرینمان شاد بکەیت بە لیقائی خۆت و پێغەمبەرەکەمان شاد بکەیت یا أکرم الاکرمین.

ئازیزان ڕەمەزانی پڕ خێرو بەرەکەتتان پیرۆز بێت، ئەم ڕەمەزانەو چەندین ڕەمەزانی تر بەخێرو خۆشی بگوزەرێنن.

ئازیزان زۆر بیرم ئەکردەوە لەم ڕەمەزانە پیرۆزەدا، چی بۆ میللەتی خۆشەویستم ئامادە بکەم، چییان پێشکەش بکەم تا گەیشتمە ئایەتێك کە خوای گەورە ئەفەرموێت: (فاعتبروا يا اولي الابصار)پەند وەرگرن، عیبرەت گر بن ئەی ئەو کەسانەی ئەقڵیان هەیە، جا منیش بیرم کردەوە خۆ دونیا قوتابخانەی ژیانە، دونیا جێی تیاڕامانەو جیّ ی تاقیکردنەوەی

ژیانە، دونیاو بەرزی و نزمی خەڵکی خۆشی و شادی خـەڵکی هـەمووی جێی پەند وەرگرتنە، بۆ پەنـد وەرنـەگرم لـە خۆشـی خـەڵکی، لەبـەرزی خەڵکی بۆ پەند وەرنەگرم، لەبێ دەسەڵاتی خەڵکی، بۆ پەند وەرنەگرم لـە زاڵم و زۆردارەکان بۆ پەند وەرنەگرم، لە هەژاران ، لەدەوڵەمەندان، بۆ پەند وەرنەگرم لە بێ نەوایان، لە نەخۆشەکان، گەیشتمە ئـەو قەناعەتـەی کـە دەبـێ ئینـسانی موسـڵمان پەنـد وەرگـرێ لـە هـەموو ژیـان هـیچ تاقیکردنەوەیەك نەڕوا لە ژیانت، تا پەنـدێکی لێ وەرنـەگریت، کەواتـە جگە لە خۆم جێگەی پەند و عیبرت وەرگرتنە ئەوە نی یە خـوای گـەورە دەفـەرمووێت(**ان في قصـصهم لعـبرة**) باسـی پێغەمبـەرانمان بـۆ ئەکات(صـەلات و سـەلامی خوایـان لەسـەر بێـت) ئەفـەرمووێت(**ان في قصصهم لعبرة**) بەڕاستی جەخت دەکا لـە چـیرۆك و سەرگوزشـتەی ئـەو پێغەمبەرانە عیبرەت هەیە، پەندو دەرس هەیە، بەڕاستی ئێمە دەبێ لـە ژیانی خەڵك پەند وەرگرین بۆ ئەمە بەرزبوو؟ هاتە خوارا چۆن دەوڵەمەند بوو؟ هاتە خوارا، چۆن هەژار بوو؟؟ هەموو ئەوانە جێ ی ئەوەیـە پەنـدو ئامۆژگاری لێ وەرگرین، بۆ ئەوەی لە ژیانی خـۆی ئـەم هەڵانـەی ئـەوان کردوویانە ئەم نەیکات، ئەو چاکانەی ئەوان کردوویانە ئەمیش لە ژیـانی خۆی لێکی بداتـەوەو سـوود مەنـدبێت، نـەوەك هـەمان هەڵـەی ئـەوان کردوویانە دووبـارەی بکەیتـەوە نـا نـەخێر تـۆ لـەژیانی ئـەوان پەنـدو ئامۆژگاری وەربگرە، ئەگەر بەرز بوو بەرزەکەی وەرگرە وە ئەگەر نزمیش بوو خۆتی لێ بپارێزە.




# مانگاکەی بەنی ئیسرائیل

بسم الله الرحمن الرحيم

الحمد لله رب العالمين. الصلاة والسلام على حبيبنا محمد (ﷺ)وعلى اله وصحبه اجمعين. السلام عليكم ورحمة الله وبركاته.

خۆشەویستان باشترین شت بۆ پەند و ئامۆژگاری قورئانی پیرۆزە چونکە پێغەمبەر(ﷺ) ئەفەرموێت(خير الكلام كلام الله) باشترین قسەو گفتوگۆو کەلامی خوای گەورەیە. جایەکەم شەوی ئەم ڕەمەزانەمان لە قورئانی پیرۆز پەندو ئامۆژگاریەکان وەردەگرین، ئەگەر چی ئەم قورئانە زۆر زۆر چیرۆك و پەندی سەرسوڕهێنەری تیایە، یەك لەم چیرۆکانە لەسووڕەتی(البقرة)یە، بزانین ئەم سوڕەتە هۆی چی یە بەناوی سوڕەتی(البقرة) کراوە بەناوی سوڕەتی (چێڵ، مانگا) کراوە؟.

کابرایەکی بەنی ئیسرائیل لە زەمانی پێغەمبەرموسی (سەلامی خوای لەسەر بێ) دا ئەژیا، ئەم پیاوە زۆر دەوڵەمەند بوو منالّی نەبوو ئەم

پیاوە برازایەکی هەبوو، زۆر تەماحی لە سامانی مامەکەی کردبوو، حەزی ئەکرد زوو مامی بمرێت، چونکە هیچ میراتگرێکی نییە تەنها ئەم نەبێ هەموو ماڵەکە بۆ ئەم ئەبێت، رۆژو شەو خەیاڵی لای سامانەکە بوو، تا رۆژێك شەیتان هەڵی خەڵەتاندوو باوەڕی پێ هێنا کە مامی بکوژێت، ئینجا ئەگاتە سامانەکە، پێ ی وت کێ ئاڵێ مامت تەمەنی ٢٠٠ ساڵیش نییە وا چاکە بۆ خۆت زۆر زوو بیکوژیت و ئەم گوزەرە خۆشەت لەپارەی مامەت دەست دەکەوێ، ئەم پیاوە بە گوێ ی شەیتانی کردوو مامەی خۆی کوشت و هەڵسا بردی لە شوێنێکی دوور لە ماڵی خۆیان فرێی دا، بۆ بەیانی چووە ماڵی مامی و پرسی کوا مامەم؟ مامۆژنی وتی: نەهاتۆتەوە، ئەمیش ووتی: چۆن نەهاتۆتەوە؟ هەڵسا بە پرسیارو گەڕان بە دوایدا ئینجا بینی لاشەی مامی لەم شوێنە کەوتووە، بووە دەنگ و هەڵلا چۆن مامەتان کوشتم؟ خوێنیم ئەوێ، هەمووتان ئەکوژم.

خەڵکەکە هاتن و کێشە چووە لای حەزرەتی موسی(سەلامی خوای لێ بێ)، حەزرەتی موسی دەستی بەپاڕانەوە کردوو داوای لە پەروەردگارکرد، ئەم کێشە ئاشکرا بێت، خوای گەورە پێ ی فەرموو(**واذ قال موسى لقومه ان الله يامركم ان تذبحوا بقرة**) خوای گەورە ئەفەرموێت: ئەی موسی(سەلامی خوای لێ بێ) فەرمان بە قەومەکەت بکە، باچێلێك سەر ببڕن. بەلام ئەم قەومە سەرکەشە گوتیان: (**قالوا اتتخذونا هزوا**) ئەی موسی تۆ گاڵتەمان پێئەکەیت ئێمە ئەڵێین پیاوێکمان کوژراوە و خەریکە دوو عەشیرەت بەشەڕدێن، تۆ چی ئەڵێی!

موسی(سەلامی خوای لەسەربێ) گـوتی: (**قال اعوذ بـالله ان اکـون مـن الجاهلین**) پەنا ئەگرم بەخوا، ئەگەرشتێك لـە نەزانینـەوە بـە ئێـوە بڵـێم، بەڵکو ئەم فرمانە فرمانی خوای گەورەیە کە دەڵێت: چێڵێك سـەر بـبڕن و گۆشتەکە بنێن بە لاشەی مردووەکە، مردووەکە خـۆی زینـدوو ئەبێتـەوەو ئەڵێت کێ منی کوشتووە. ئینجا لێرە بەنی ئیسـرائیل کەوتنـە پرسـیار کردن، پرسیارکردنێکی زۆر چێڵەکە چۆن بێ درێژی چەندبێ ڕەنگی چـۆن و چەند قەڵەو بێ.

ئیتر ئەوە بەڕوونی لەسوورەتی(**البقرة**)دا باسکراوە، بەنی ئیـسرائیل و گەرمە گەرمی گفت و گۆ و موناقەشە جێ ئـەهێڵین. ئەچـینە لایـەکی تری چیرۆکەکە، پیاوێکی صالح و لەخوا ترس هـەبوو پیـاوێکی زۆر بـاش بوو، چێڵێکی هەبوو بۆ خـۆی بـەخێوی ئـەکرد، ڕۆژ بـە ڕۆژ بـەروبوومی ئەهێنا بازاڕو ئەیفرۆشت، ئەم پیاوە لە هەموو دونیا یەك کـوڕی بـچووکی هەبوو ئەم پیاوە حاڵەتێکی بەسەر هـات، زانـی کـە ئـەمرێت و منـاڵ و خێزانەکەی ئەم چێڵەیان پێ بەخێو ناکرێت، چووە ناو شاخ و پاڕایـەوە لـە پەروەردگار و داوای لێکرد و گوتی: خوایە گیان من ئەم چێڵەی تۆ لای تۆ بە ئەمانەت دائەنێم، هەر کات مناڵەکەم گەورە بوو ئاقـڵ بـوو، تـۆ ئـەم چێڵە بگەڕێنەوە بۆی پێ ی ببەخشەوەو لای خێزانەکەی وەسـیەتی کـردوو گوتی ئەم چێڵەم بە ئەمانەت داوە بە (**رب العالمین**)، هەر کاتێك کوڕەکـەم گەورە بوو تۆ پێی بڵێ بابچێ لەم شـاخانە داوا لـە پـەروەردگاری جیهـان بکات و بانگی چێڵەکە بکات چێڵەکە خۆی دێ، بەڵێ کابرا مردوو دونیای

جێهێشت. چەند ماوەیەکی پێچوو ئەو کورە بۆخۆی گەنج بوو، گەیشتە ئەوەی ئەقلی هەبێت، دایکی پێی گوت:رۆڵەگیان باوکت چەند ساڵ بەرلەئێستا چێڵێکی هەبوو، بەئەمانەت دای بە پەروەردگار، جا رۆڵەگیان تۆش برۆ ناو ئەم شاخ و کێوانە بانگی چێڵەکە بکەو لە خوای گەورە داوای بکەوە.

کورەکەش ئەچێتە ناو شاخەکان و ئەڵێ یا (رب العالمین). ئەی خالقی ئاسمان و زەوی، باوکم لای تۆ ئەمانەتێکی جێهێشتووە، من کوری ئەوم هاتووم ئەمانەتەکە وەرگرمەوە، ئینجا بینی چێڵێکی زۆر گەورەو رەنگ زەرد کە هێندەی شیر تیابوو، هاتە ژێر دەستی کورەکەو راوەستا، کورەکەش زانی ئەمە ئەمانەتەکەی باوکی بوو کەلای پەروەردگار بوو، ئینجا دەستی لە ملی کردوو هێنایەوە ماڵێ لای دایکی.

دایکی وتی رۆڵە برۆ لە بازار بیفرۆشە، بەلاّم تا نرخەکەی بەمن نەڵێی نەیدەی بەکەس. ئەبێ نرخێکی باشت پێبدەن، چونکە ئەم چێڵە خوای پەروەردگار بۆ خۆی ئاگاداری بووەو بەخێوی کردووە. پێئەچێت خێرو بێرێکی باشی هەبێت.کورەکە ئەچێتە بازار بۆ ئەوەی چێڵەکە بفرۆشێت.

بێینەوە لای بەنی ئیسرائیل پێك هاتن کە چێڵەکە سەربڕن ، بچن لەبازار ئەم چێڵە بکڕن بەلاّم چێڵەکە ئەبێ بەم سیفەتانەی خوای گەورە ئەیڵێ: زەردبێ، گوانی گەورە بێ. چوونە بازار هیچ چێڵێك نەبوو تەنها هی ئەم کورە، بەم سیفەتانە بوو.

چوونە لای گوتیان: بەچەند ئەیفرۆشیت؟ گوتی: وەرن معامەلە لەگەڵ دایکم بکەن. چوون بۆ لای دایکی. دایکی کورەکە وتی ئەم چێڵەتان بۆ چییە؟ گوتیان: کێشەیەك هەیە حەزرەتی موسی وتوویەتی چێڵێك بکڕین و سەری ببڕین تا کابراش زیندوو بێتەوە.دایکی کورەکە وتی: پڕ بە پێستی زێر نەبێ نایدەم، چەند ووتیان زۆرە، وتی نایدەم بچن بۆ خۆتان یەکی تر بکڕن، بەڵام ئەمان هێندە لەسەر خۆیان گران کرد، هێندە پرسیاریان کرد، تا خوای گەورە بە مواسەفاتی خۆی لەسەری فەرز کردن، ئەگەر نا هەر چێڵێك با ئەبوو، ئینجا پڕ بە پێستی چێڵەکە زێڕیان پێدان، ئینجا چوون سەریان بڕی و گۆشتەکەیان بەلاشەی پیاوەکەوە نامردووەکە زیندوو بوەوەو وتی: کەس تاوانبار مەکەن ئەم برازایەم منی کوشتووە دووبارە مردەوە.لێرەدا خوای گەورە یاسای داناو گوتی: هەرکەس کەسێکی تر بکوژێت لە پێناو میرات، بێبەش ئەبێت لە میراتەکە.

جا خۆشەویستان ئەم چیرۆکە قورئانیە بوو بەهۆی هاتنە خوارەوەی ئەم سوورەتە. جا ئەم پەندوو عیبرەتانە وەرگرن:

یەکەم: فەزڵی سورەتی (البقرة)کە فەزلێکی زۆری هەیە لە دونیا، پێغەمبەر(ﷺ) ئەفەرموێت: ﴿هەرکەس سورەتی (البقره)بخوێنێت (٣) رۆژ شەیتان ناوێرێت بێتەوە ئەم ماڵە، لەقیامەتیشدا ئەم سورەتە لەگەڵ سورەتی دوای خۆی، ئەبنە چەتر لەسەر ئەم کەسەی خوێندوویەتی﴾.

هەرکەس سورەتی (البقرة و آل عمران) لەبەر بکات، رۆژی دوایی، ئەو رۆژەی ئێستا(٩٣٢٠٨٢٢٧)میل لێمان دوورە، رۆژی قیامەت یەك

میل ئەمێنێتەوە لەسەر سەرمان تینو گەرمایەکی زۆری هەیە، ئەم دوو سورەتە لێناگەڕێن تین و گەرمایی ئەم ڕۆژە کاریگەری لەسەر سەرو مێشکی هەبێت).جا بەڕاستی شتێکی گەورەو پیرۆزە.

دووەم خاڵ ئەوەیە: ئەبێ مرۆڤ صالح بێ، لەخوا ترس بێت، صالحی و موتتەقی تۆ، کاریگەری لەسەر منالەکانت ئەبێت. بینیت ئەم بۆ خۆی صالح بوو، خوای گەورە خێزان و منالەکەی پاراست.

ئازیزانم ... ڕەمەزان بۆ صالح بوونە ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ كُتِبَ عَلَيْكُمُ الصِّيَامُ كَمَا كُتِبَ عَلَى الَّذِينَ مِن قَبْلِكُمْ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ﴾ بۆ تەقواکردنی پەروەردگارە. جا بەڕاستی ڕەمەزان جێی صالح بوونە، جێی لەخواترسانەو نزیك بوونەوەیە لە خوای گەورە. بۆ ئەوەی ماڵ و منالەکەشت خێر لە تەقوای تۆ ببینن.

-خاڵێکی تر هەیە ئەویش، جێ بەجێ کردنی ئەوامری ئایینی ئابێ هیچ منجەمنجی تیابێت، هەرچیەك بەسەرتا هات بڵێ ﴿سمعنا وَأطَعْنَا﴾ یەکسەر جێ بەجێی بکەو زۆر پرسیار مەکە.ئەگەرنا دەبێتە هۆی سەرلێشێواویت و لەخۆت تێك ئەدەیت. وەك ئەوەی خوای گەورە بە پێغەمبەر (ﷺ) ئەفەرموێت: ﴿ڕۆژوو بشکێنن و لەگەڵ بانگی مەغریب افطار بکەن﴾کەچی تۆ ڕاوەستی تا نوێژی مەغریب ئەکەی. ئا..دینداری ئەوەیە پارشێو درەنگ بخۆیت و زوو فتار بکەیتەوە. خۆشەویستان پەندو ئامۆژگاری زۆری تیایە، بۆ ئێوەی جێ دێڵم، بەخواتان ئەسپێرم.

**السلام عليكم ورحمة الله وبركاته**




# بەخشەکانی خودا

بسم الله الرحمن الرحيم

الحمد لله رب العالمين. الصلاة والسلام على حبيبنا محمد (ﷺ)وعلى اله وصحبه اجمعين. السلام عليكم ورحمة الله وبركاته.

ئازیزان و خۆشەویستان ڕەحمەت و میهرەبانی خوای گەورە برژێت بەسەرتانا. یا ڕەبی خوایە گیان، لە گوناهەکانمان خۆش بیت و دڵ و دەروونمان بە نووری خۆت ڕووناك بکەیتەوە. خوایەگیان هیدایەتمان بدەی ، ڕاگیرمان بکەی لەسەر ڕاستە ڕێی ئیسلام ئەم ڕەمەزانەمان لێ قبوول بکەیت، یا ڕەبی خوایەگیان بەبەهەشتی بەرینمان شاد بکەیت، یا ڕەبی خوایەگیان ئەوانەی لێقەوماون و داوات لێدەکەن بەهانایان بچیت، وە ئەوانەی نەخۆشن شیفایان بدەیت، خوایەگیان ئەوانەی قەرزارن، بەرەکەت بخەیتە ڕزقیان، خوایە گیان بەهانای ئەوانە بچیت ،کە خەم و پەژارەیان

هەیە و بۆیان سووك بکەیت یا أکرم الاکرمین.

نازیزانم... بۆ چیرۆکی ئەم جارەمان تا ببێتە مایەی پەندوو عیبرەت وەرگرتنمان ، ئەچینە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ)چونکە تا خوای گەورە و پێغەمبەر(ﷺ) قسەمان بۆ بکەن، نابێت ئێمە هیچ قسەیەك بکەین، چونکە قسەی ئەوان بەر لە هەموو قسەیەکە. ڕای ئەوان بەر لە هەموو ڕایەکە دەستوری ئەوان بەر لە هەموو دەستورو بڕیاری کەسێکە ئەمشەو لە خزمەت پێغەمبەرمان(ﷺ) دادەبین بزانین چیمان بۆ ئەڵێت: جابری کوڕی عبدالله (ڕەزای خوای لەسەر بێت) کە پێغەمبەر(ﷺ) ئەفەرمووێت: ئەی صەحابییەکان جبرائیل ئەم چیرۆکەی بۆ گێڕاوەمەتەوە، کەواتە چیرۆکەکە هی حەزرەتی جبرائیلە، با بزانین چی بە پێغەمبەر(ﷺ) ئەڵێت: ئەفەرمووێت لە بەنی ئیسرائیل لە زەمانی بەر لە ئێوە پیاوێك هەبوو، گۆشەگیر لە شوێنێکدا لە ئەشکەوتێکدا، عیبادەتی خوای گەورەی ئەکرد، ئەفەرمووێت: (٥٠٠) پێنج سەد ساڵان ئەم پیاوە عیبادەتی خوای گەورەی ئەکرد، تەنها سوجدە و پاڕانەوە، تەنها ویردی خوای ئەکرد، لە ناو ئەم ئەشکەوتەدا، جگە لە پاڕانەوەو یادی خوا، هیچی تری نەدەکرد، خوای گەورەش بۆ ئەم پیاوە چەند نازو نعمەتێکی بەخشیبوو، ئەم ئەشکەوتە لە چیایەکدا بوو هەر چوار دەوری ئاو بوو، بەڵام ئاوێکی سوێر بوو نەئەخورایەوە، خوای گەورە وای کرد بوو، لەلایەکی ئەم ئەشکەوتە چاڵێك هەبوو، لەم چاڵە ئاو دڵۆپ دڵۆپ ئەهاتە خوارەوە لە چیا ئاوەکە

شیرین بوو تا بەیانی پڕ ئەبوو لە ئاو، ئەمیش ئەی خواردەوە.

لەلایەکی تر دوو دار هەنار ڕووابوون، لەم دار هەنارە هەموو ڕۆژێـك هەنارێکی لێ ئەکردەوەو ئەیخوارد، تا بەیانی ئەئەهاتە خوار ئەمـە حـاڵی ئەم پیاوە بوو،(٥٠٠) ساڵان بەم جۆرە ژیا، لـە پـەروەردگاری داوا ئـەکرد ئەی وت: خوایە گیان لە سوژدە ئەبێت ئەمرم و رووحـم دەرئەچـێت، هـەر ئەبێت لە سوژدەدا بمرم. خوای گەورەش ئەم دوعایەی بۆ قبووڵ کردوو. ئەم پیاوە لە سوژدەدا بوو کە ڕووحی کێشاو بـردی بـۆ لای خـۆی، حـەزرەتی جبرایل چیرۆکەکە بۆ پێغەمبەر(ﷺ) تـەواو ئـەکات و ئەفـەرموویێت: کـە هاتە خزمەت خوای گەورەو خوای بەرزو باڵا دەسـت پـێ ی فـەرموو: بـە ڕەحمەتی من برۆ بەهەشـت، ئـەمیش وتـی: خوایـە گیـان بـە عـەمـەل و کردەوەی خۆم، خوای بەلوتف و بەزەیی پێ ی فەرموو: ئەی بەنـدەی خـۆم بەرەحمەتی من برۆ بەهەشت، ئەمیش وتی: خوایە گیان بەکردەوەی خـۆم، بۆ جاری دووهەم و سـێهەم خـوای گـەورە پـێ ی فـەرموو: ئـەی بەنـدەم بەڕەحمەتی من برۆ بەهەشت، ئەمیش وتی: خوایە گیان بـەکردەوەی خـۆم ئەچم، (٥٠٠)ساڵ بەندەیی‌و سوژدە بردن و پاڕانـەوە/ (٥٠٠) سـاڵ زکـرو ویردکردن، (٥٠٠) ساڵ ژیان بێ درۆکردن‌و غـەیبەت کـردن، (٥٠٠) سـاڵ پاکی و... خوای گەورە فەرمووی: ئەی فریشتەکان کردەوەی (٥٠٠)ساڵی ئەم بەندەیە بێنن، کە پێ ی مغرور بووە هەروەها نیعمەتی دوو چاوانیشی بێنن لە تای تەرازوو دای بنێن، کـردەوەی (٥٠٠)سـاڵ هـەقی دوو چـاوی

نەدایەوە، ئینجا پاڕایەوەو داوای لە پەروەردگاری کرد کە بە لوتف و ڕەحمەتی خۆی بیباتە بەهەشت، ئینجا خوای گەورە پێ ی فەرموو: ئەی بەندەی خۆشەویست بڕۆ بۆ بەهەشت.

ئازیزانم پەندوو ئامۆژگاری چییە؟ لەم چیڕۆکەی حەزرەتی جبرائیل بۆ پێغەمبەر(ﷺ) گێڕایەوە؟:-

یەکەم: ئەبێ بزانین کە نازو نیعمەتێکی زۆرمان پێ بە خشراوە بۆ نموونە: مانگی ڕەمەزان گەورەترین نازونیعمەتی خواییە، کە بە ئوممەتی پێغەمبەر(ﷺ)ی بەخشیوە، ئەی لە سایەی ئەم ڕەمەزانە نییە کە پاك ئەبینەوە لە گوناه و یەکترمان خۆشئەوێ، ئەی لە سایەی ئەم ڕەمەزانە نییە، هەموو عیبادەتەکان بەرێك و پێکی ئەکەین و مزگەوتەکان ئاوەدان و مامۆستاکان چالاك کەوتوون ئامۆژگاری ئەکەن، خەڵکی لەو پەڕی ڕێکوپێکی یە فێڵ بازی نەماوە، ئافرەتەکان بالآیان پۆشیوە ژیانێکی ئارامو خۆشە ئەمە گەورەترین نیعمەتی پەروەردگارە بە بەندەی بەخشیوە، ئازیزان: نازو نیعمەتی خوای گەورە زۆر زۆرن ئەبێ مرۆڤ بیریان لێ بکاتەوە.

دووەم: ئەو نیعمەتانەی کە خوای گەورە پێی داوین، ئەبێ لە بەرامبەری دا چاکەی بدەینەوە، خوای گەورە دەستی پێ داوین نابێ تۆ زوڵم و خراپەی پێ بکەی، ئەبێ لە خزمەتی خوا دابێ، لەخزمەتی هەژارانو بێ نەوایاندا بێ، ئەمە بەرامبەری نیعمەتی خوایە، خوای گەورە

دوو چاوی جوانی پێ داوین، نابێ گوناه و نەزەری پێ بکەین.

بەڵکو بۆ ئەوەیە گەورەیی پەروەردگار ببینی. بۆ ئەوەیە ئەقڵ و تێگەیشتنت زیاتر بکەی، پاشان بۆ سوودی خۆت و ژیانت بەرێزان: نیعمەتەکان زۆرن(**وان تعدوا نعمة الله لا تحصوها**)، ئەم نیعمەتانە پێویستییان بە بەرامبەر هەیە، ئەبێ بەرامبەرەکان بە چاکە بکەین، نەوەکو بەخراپەو گوناه.

سێیەم: دەرسوعیبرەت ئەوەیە، کە خوای گەورە خاوەنی هەموو شتێکە نازو نیعمەتێکی زۆری پێ بەخشیوین، بەلام ئەبێ بزانین چۆن هەڵسوکەوتیان لەگەڵ بکەین، ئەبێ خواناسی تیادا ئەنجام بدەین. ئەم کابرایە زیاتر بیری لەگەورەیی خوای میهرەبان ئەکردەوە جا بەڕاستی ئەبێ زیاتر بیر لە نیعمەتی پەروەردگار بکەینەوە، بەلای شوێنێکا ڕەت ئەبی، دەبێ بەر لە هەموو شتێ گەورەیی خوای تیا بەدی بکات، ئینجا مەنفەعەتی دووەمی تیا بەدی بکاتو ووریابن هیچ شێك بەبێ ناسینی پەروەردگار لە دەست مەدەن.

چوارەم: دەبێ مرۆڤ خوای بالا دەست زۆر باش بناسێ ئەم بەندەیە وەلیش بوو، بەلام ناسینی خوای گەورەی کەم بوو، چونکە ئەگەر بیزانیبا خوای گەورە فەزڵی بەسەریا کردووە ئەم هەموە عیبادەتە ئەکات، ئەی ئەوت خوایە بە کردەوەی خۆم لەگەڵم بکە، ئەگەر چەند ڕۆژێك بە ڕۆژوو ئەبێ، بەچەند جوزئێك لە قورئان خوێندن مەغرور مەبە، ئەمانە بەرامبەر ئەم هەموو نازو نیعمەتەی خوای گەورە هیچ نین، نازو نیعمەتی خوای

گەورە زۆر زۆرە، ئەگەر سەر لە سوژدەدا بگرین تا ئەمرین، هەقی دەستێکمان نەداوە، سەیری ئەم پیاوە بکەن (٥٠٠)ساڵ هەقی دوو چاوی بووە، ئەگەر ئێمە (٧٠)ساڵێك بژین، نیوەی خەوتووین، لە نیوەکەی تر منالّی دەربکە، (٢٠)ساڵ ئەمێنێتەوە، کە ئەگەر رۆژانە (٢٠)سەعات عیبادەتی پەروەردگاری پێبکەین، هەقی یەك پەنجەشت نەداوە، تەماشا دوو گوێ و دوو چاو و بالآی رێکت هەیە، ئەی ئەمانە هەموو نیعمەتی خوای گەورە نین، بۆ سەیری دەورو بەرت ناکەی ؟ کەواتە مەغرور مەبە بەم کەمە عیبادەتە، هیچت لە تەرازووی خوای بالا دەست بۆ زیاد ناکات، هەتا هەموو شتێك بەفەزلّ و میهرەبانی خوای گەورە بزانە، هەتا ئەم عیبادەتەش کە ئەیکەین، وەللاهی نارۆینە بە هەشت، مەگەر رەحمەتی خوای گەورە نەبێ، پێغەمبەر(ﷺ) ئەفەرمووێت: کەسمان نارۆینە بە هەشت تەنها بەرەحمەتی پەروەردگار نەبێ، فەرموویان: (حتى انت یا رسول الله)(ﷺ) وتیان: تۆش ئەی پێغەمبەری خودا؟ فەرمووی: منیش، تەنها(الا ان یتغمدني الله برحمته)تەنها ئەگەر خوای گەورە بمپۆشێت لە نازو نیعمەتی خۆی، ئینجا دەچمە بە هەشت، جا خۆشەویستان دەبێ عیبرەت و ئامۆژگاری لەم چیرۆکانە وەربگرین بۆ ئەوەی ژیانمان پێ رووناك بکەینەوە و قیامەتمانی پێ ئاوەدان بکەینەوە، تاچیرۆکێکی تر بە خواتان ئەسپێرم

السلام علیکم ورحمة الله وبرکاته

٣

# چ بچینی ئەو دەدوورییەوە

بسم الله الرحمن الرحیم

**الحمد لله رب العالمین، الـصلاة الـسلام علـی حبیبنـا محمـد(ﷺ) وعلی اله وصحبه اجمعین**

**السلام علیکم ورحمة الله وبرکاته.**

خۆشەویستان و ئازیزان خۆشحاڵم بتـوانم لـە خزمـەتتان بم، بـەڕێزان میهرەبانی و ڕەحمـەتی خـوای میهرەبـان بڕژێـت بەسـەر دڵ و دەروونمـان، خوایە گیان لە گوناهمان خۆشبیت بـە لوتـف و بـەزەیی خـۆت لەگـەڵمان بجولێیتەوە ئەم دڵەمان بە نووری خۆت ڕوونـاك بکەیتـەوە، خوایـە گیـان عیبادەتمان قبووڵ بکەیت، لە ئاگری دۆزەخ بمانپارێزیت، بـۆ خـاتری نـاوە پیرۆزەکانت لە گوناهی دایك و باوکمان خۆشبیت، ئەوەی نەخۆشە شـیفای بـدەی، ئەوانـەی قـەرزارن یارمـەتییان بـدەی و ئەوانـەی لێقـەوماون بـە

هانایانەوە بچیت، خوایە گیان ئەوانەی خەم و پەژارەیان هەیە لەسەریان هەڵگری، بۆ خاتری ئاوە جوانەکانت ئەسرەتی موسڵمانان بدەی و سەرکەوتوو سەرفرازیان بکەیت **یا اکرم الاکرمین امین.**

خۆشەویستان بۆ چیرۆکی ئەم جارەمان بۆ پەندوەرگرتنمان لە ژیانی خەڵکی، باسی پیاوێك ئەکەین، کە عەرەبە و ناوی(**ابن جدعانە**) پیاوێکی زۆر رێك و پێکە بۆ خۆی ئەگێڕێتەوەو ئەڵێ: ساڵێکیان خوای گەورە ئاوڕی لێدامەوەو وشترێکی زۆری پێبەخشیم کە بەهار هات ئەم وشترانە ماڵی ئەوە بوون، سەیریان بکەی لە جوانی و قەڵەوی و گوان پڕ لە شیری، لەهەر هەموویان جوانترم هەڵبژاردو وتم، ئەیدەم بەم دراوسێیەمان، کە حەوت کچی هەیە و کەس نییە یارمەتییان بدات، ئەم وشترەم بە خەڵات دا بەم ماڵەی دراوسێمان و زۆر کەیف خۆش و سوپاسگوزار بوون، بۆ خۆیان وشترەکەیان بە خێو ئەکردو شیرو بەروبوومی وشترەکەیان ئەبرد لە بازاڕ ئەیانفرۆشت و گوزەرانیان پێ بەڕێ ئەکرد، ساڵی ئاینده هات هاوینێکی زۆر گەرم بوو، ئاو نەبوو زۆر لە وشترو مەڕو ماڵاتمان بە فیڕۆ چوو، سێ کوڕم هەبوو وتم: ڕۆڵە بابڕۆین بە دوای ئاو بگەڕێین گەر ئاو نەبێ هەموو وشترو مەڕو ماڵاتمان ئەمرێ و خۆشمان لەناو ئەچین، جا چووین و دەستمان بە گەڕان کرد، لە بیابان شوێن هەیە زەوی شەقی بردووەو ئاوی تێدا هەیە گوتی: چەند شوێنێك گەڕام ئاوم ئەدۆزیەوە، ئەم جارەیان لە شوێنێك چوومە خوارێ کە زۆر ماندوو بووم کاتی عەسر بوو، وتی: کە چووم چەند

شوێنێك گەڕام زۆر تاریك بوو ڕێم لێ وون بوو، بە هەرلایەك ئەڕۆیشتم ڕێ نەبوو زۆر هیلاك بووم و کەوتم.

کە بە هۆش خۆم هاتمەوە نەمزانی شەوە یان ڕۆژە بەڵام بینیم ئاوی لێ یە هەر نەگەڕام و ئاویشم نەخوارد (٣)شەوی پێچوو هەر لەم چاڵە مامەوە وتی: پاش ئەوەی زۆر هیلاك بووم کەوتم، کوڕەکانیشی لەسەرەوەی چاڵەکە چاوەڕوان بوون یەکیان وتی: ئێمە بۆ هێندە چاوەڕێی باوکمان ئەکەین کێ ئەڵێ: باوکمان ماوە؟! گیاندارێك نەی کوشتووە؟ ئەگەر باوکم (٣)ڕۆژ نەیەتە دەرەوە یان لە تینوان خنکاوە؟ یان لە برسان مردووە؟ وەیانیش گیاندارێك ئازاری پێ گەیاندووەو مردووە؟ ئەوانی تریش بڕوایان هاتوو گەڕانەوە ماڵ وتیان: دایکە گیان ئەوە (٣) ڕۆژە وەستاوین باوکمان نەهاتۆتە دەرێ و مردووە، دوایی دراوسێ و دەوروبەر هاتن و سەردانیان کردن و سەرە خۆشییان لێ کردن، دواتر کوڕێکیان وتی: بۆ میرات بەش نەکەین! با دەست بە میرات دابەش کردن بکەین، ئیتر دەستیان کردە میرات بەش کردن، یەکێکیان وتی: خۆ ئێمە وشترێکی زۆر باشمان لەم ماڵەی دراوسێمانە بۆ نەچین نەی هێنینەوە، باوکم پێ ی داون خۆ ئێمە نەمانداونەتێ، وتی: من ئەڕۆم ئەی هێنمەوە، دوو براکەی تری وتیان: ئەگەر هێناتەوە بۆ خۆت ئێمە حەقمان بەسەریەوە نییە، چووە ماڵی دراوسێکەیان و لە دەرگای دا وتیان: فەرموو، وتی: هاتووم تا وشترەکەمان ببەمەوە وتیان: خۆ باوکت ئەمو وشترەی داوە بە ئێمە و هی

تۆ نی یە!! وتی: باوکم مردووەو نەماوە، وتیان: چۆن باوکت مردووە؟ ئەمیش ووتی: (٥)ڕۆژە مردووەو لە فلآنە شوێن، ئەوانیش‌و وشترەکەیان دایەوە و کابرای دراوسێ هەرچی پێویست بوو لە گوریس و شتی تر، هەڵسا بردی و ڕۆیشت، تا گەیشت بە شوێنەکە ڕۆژێکی تەواوی پێچوو وتی: گوریسم بەست و پەتەکەم هەڵواسی و چوومە خوارەوە، زۆر گەڕام تا بینیم لەوێ لەسەر سك کەوتووە و ئازاری زۆری پێگەیشتووە، ئینجا چاویم بەستەوە تا ئازاری پێ نەگات و هێدی هێدی ڕام کێشاو هێنامە دەرەوە، بردمەوە ماڵ خزمەتمان کرد تاوەکو چاك بوویەوە، سوپاس بۆ خوا ئەم جارەیان نەمردووە، پرسی کوا کوڕەکانم؟ وتیان: کوڕەکانت وتویانە باوکمان مردووە. پرسیان ئەوە تۆ چەند ڕۆژە لەوێ ی؟ ئەویش وتی: من لە فلآن ڕۆژەوە لەوێم، (٥)ڕۆژ بوو لەوێ بوو، وتیان: چۆن نەخنکاویت لە تینوان؟! وتی: ڕۆژی یەکەم و دووەم ئاوم ئەخواردەوە پاشان هیلاك بووم لە ئاو خواردن و (٣)ژەمە یەکێك ئەهات و بەچاو ئەم ئەدی جامێك شیری‌و وشتری بۆ ئەهێنام، بەیانیان، نیوەڕۆیان، ئێواران بۆی ئەهێنام، بەلآم دوو ڕۆژە شیرەکەم لێ براوە، بۆیە وا حاڵم خراپە پێی ئەدام کەبتوانم بژیم ، ئەمنەتوانی تا قەت بکرم و بێمەدەر.

ئەمانیش وتیان: ئەوە دوو ڕۆژە کوڕەکانت هاتوون و وشترەکەیان لە ئێمە سەندۆتەوە، جا خۆشەویستان سەرنج بدەن ئەم دیمەنە ئەم پیاوە لەبەر خاتری خوای گەورە ڕزگاری کردو لەشیری‌و وشترەکەشی خوارد سبحان الله

پەندو عیبرەت لەم دیمەنە ئەوەیە:-

یەکـەم: ئەگـەر مـرۆڤ خـوای گـەورە پـێ ی دا بـارەزیلی نـەکات و بیبەخشێت لە باشترین ساماني، چونکە خوای گـەورە ئەفـەرمووێت(لـن تنالوا البر حتى تنفقوا مما تحبون) واتە: ئێوە ناگەنە ئەو پەڕی چاکە تـا ئەوشتە نەبەخشن، کە لە هەموویان زیاتر لە دڵتان شـیرین تـرەو لـەلاتان خۆشەویستره، پیاوێکی هەژار لە دەرگای ماڵێکی داو، وتی: دینارێکم پێ بـدەن، خـاوەن ماڵەکـەش وتـی: ئـافرەت کیلـۆ شـەکرێکی پـێ بـدە، ئافرەتەکـەش وتـی: ئـاخر ئـەو داوای دینـارێکی کـردووە! بۆچـی کیلـۆ شەکرێکی بۆبێنم؟ وتی: چونکە حەز بە شـیرینی ئەکـەم خـوای گـەورەش ئەفەرمووێت (لن تنالوا حتى تنفقوا مما تحبـون) لای مـن لـە هـەموان شیرین تر شەکرەکەیە و برۆ پێ ی بدە، تا ئەم خێرەمان پـێ بگـات و ئـەم ئایەتـە جـێ بـە جـێ بکـەین، ئـازیزان کاتێـك چێـشت و خـواردن بـۆ دراوسێکەت ئەنێریت پاشماوەکە مەنێرە بەڵکو کامەت لا شیرین تـرە ئـەم بنێرە.

دووەم: هەرچی بکەی دێتەوە رێت چاکە بکە، دێتەوە رێت، ئەم پیاوە پێویستی بەم شیرە بوو لەم کاتەدا خوای گەورە هێنایەوە رێ ی

سێیەم: پەندی سێهەمان ئازیزان زۆر ئاگـاداری ئـەو ماڵانـە بـن کـە کچیان زۆرەو کەسیان نـی یـە ئیـشیان بـۆ بکـات پێویـستە یارمـەتییان بدرێت، هەروەك لەم چیرۆکە بیستمان کە چۆن یارمـەتی ئـەو ماڵـەی کـە

کەسیان نییە، بەخێویان بکات، تا گوزەرانیان باش بێت.

چوارەم: پەندێکی تر ئەوەیە مرۆڤ ئەو شتەی ئەیەوێت، بابۆ خۆی بیکات و چاوەڕێی ئەکات کورەکانی بۆی بکەن بۆ خۆتان بۆ قیامەتی خۆتان بکەن،، سەیر بکەن کورەکانی ئەم پیاوە بیریان لە میرات کردەوەو دەستیان کردە میرات بەش کردن بەر لە هەمووشتێك، ئازیزان کورەکانتان رەحمەتێکیشتان بۆ نانێرن جا بۆ خۆتان هیممەت بکەن، بەرێزان پەندوو ئامۆژگاری زۆری تێدایە، بە تایبەتی بۆ ئەوانەی خوای بالا دەست پێی بەخشیون ئەم ماڵەتان بە بەخشین کەم ناکات، بەڵکو ئەبێتە رزگاریتان لە تەنگ و چەڵەمەدا. تا چیرۆکی تر بە خواتان ئەسپێرم .

**السلام عليكم ورحمة الله وبركاته**

٤

# سامان ببەخشە

بسم الله الرحمن الرحيم

السلام عليكم ورحمة الله وبركاته الصلاة وسلام على حبيبنا محمد(ﷺ) وعلى اله وصحبه اجمعين.

ئازیزان سەلام و رەحمەت و میهرەبانی پەروەردگاری ئازیز بڕژێ بەسەرتان، یارەبی خوایە گیان لە گوناهمان خۆشبیت و یارمەتیمان بدەی، دڵمان بە نووری خۆت ڕۆشن بکەیت، خوایە گیان خۆشەویستی خۆت و پێغەمبەری ئازیزمان محمد(ﷺ) لە دڵمان جێگیر بکەیت، خوایە گیان عیبادەتمان قبووڵ بکەیت، لە ئاگری دۆزەخ بمانپارێزی، خوایە گیان شیفای نەخۆشەکانمان بدەی، قەرزی قەرزارانمان بدەیەوە، بەرەکەت بخەیتە ڕزقیان، بە هانای لێقەوماوان بچیت و یارمەتی دەست کورت و هەژاران بدەیت و ڕەحمەت و بەرەکەت بڕژێنی بەسەریان یا اکرم الاکرمین، یاالله آمین.

بۆ چیرۆکی ئەم شەو ئەچینە خزمەت پیاوێکی خواناس و رێك و پێك کە زانایەکی بەرزە ناوی(فوضە یلی کوری عیاض)ە ئەم زانایە ئەفەرموویت: پیاوێك بۆی گێرامەوە کە ئینسانێکی زۆر دەست کورت و هەژار هەبوو، رۆژێك لە ماڵ پێویستییان بە خواردن بوو، هیچیشیان نەبوو بیخۆن و حاڵیان زۆر خراپ ئەبێت، پارچە بەرێکی دراویان ئەبێت ئافرەتەکە ئەیدا بە پیاوەکە و ئەڵێ: برۆ بیفرۆشەو نانێکی پێ بکرە و بیهێنە ماڵەوە تا بیخۆین، پیاوەکەش پارچە (١) بەرەکە ئەباتە بازارو بە درهەمێ ئەیفرۆشێت، ئەیەوێت بچێ نان بکرێت و بۆ ماڵ و منداڵەکەی بیباتەوە سەیر ئەکات دوو کەس بە شەرهاتوون و هەموو گیانیان خوێنە ئەمیش، لە خەڵکەکەی پرسی ئەوانە بۆ وا ئەکەن؟! وتیان: لەسەر درهەمێ بە شەڕهاتوون، ئەمیش ووتی: بەشەڕ مەیەن فەرموو: ئەوە من ئەم درهەمەتان پێ ئەدەم و لە ڕاهی خوا ئاشت ببنەوە، وتیان: زۆر باشە ڕۆیشتن، ئەمیش بە دڵساردی چوویەوە ماڵ و ئافرەتەکەش وتی: ئەمە چیت کردووە کوا پارە ئەی کوانێ بەرەکە؟ بۆ نانت نەکریوە؟ ووتی: بەدرهەمێك فرۆشتم و درهەمەکەشم کردە خێر، ئافرەتەکەش هەندێ قاپ و پێویستی ماڵێیان هەبوو پێیدا و بردی تا بیفرۆشێت، ئەم پیاوە تا عەسر لە بازاڕ گەڕا کەس درهەمێکی بەم کەل و پەلە نەدا، عەسرێ (٢) ئەگەڕایەوە لە رێگا دا بینی پیاوێك ماسی ئەفرۆشێت و خەریکە ماسی یەکەی تێك ئەچێ و بۆی نافرۆشرێت. ئەمیش ووتی: کاکە وەرە با ئەم کەل و پەلانە

بەم ماسیانە بگۆڕینەوە، نەکەس ماسیەکان لە تۆ نەکڕێت، نەکەسیش ئەم کەلوپەلانە لەمن دەکڕێت.

ماسی فرۆشەکە ڕازی بوو، مامەڵەیان کرد، گەڕایەوە ماڵ و ووتی: ئافرەت بە حاڵ تا ئەم مامەڵەیەم کردووە، ئافرەتەکەش ماسیەکە چاك ئەکات بۆ ئێوارە، شتێکی زۆر جوان ئەبینێت، لە کاتی چاك کردنیدا بانگی پیاوەکە ئەکات و ئەڵێت: ناوسکی ماسیەکە ئەمەی تیایە، پیاوەکەش سەیری ئەکات ئەڵێ: ئەمە (دوڕە) گەوهەرێکی زۆر جوانە لە خۆشیان نان خواردنی لەبیر ئەچێت و ئەیباتە لای هاوڕێیەکی کە زێڕینگرە ئەڵێ: هاوڕێ ئەمەم هەیە بزانە چی یە؟ ئەمیش ئەڵێت: (٤٠٠٠٠) چل هەزار درهەمی پێ ئەدەم، گەر بیفرۆشیت گەر نا فلانە کەس زیاتری پێ ئەدات، بڕۆ بۆ لای ئەو، ئەمیش ئەیباتە لای ئەو ئەویش(٨٠٠٠٠) هەشتا هەزار درهەمی پێ ئەدات، بەلام ئەڵێ: فلان کەس ئەو لە هەموو کەس زیاتری پێ ئەدات، پیاوەکەش ئەیباتە لای ئەم دوکانەوە(١٢٠٠٠٠)سەدو بیست هەزار درهەمی پێ ئەدات ، ئەیفرۆشێت (١٢) کیسەی پێ ئەدات هەر کیسەی (١٠٠٠٠) دە هەزار درهەمی تیایە، ئەگەڕێتەوە ماڵ سەیر ئەکات هەژارێك لە دەرگایان دەدات، ئەمیش بیر ئەکاتەوەو ئەڵێ: دوێنێ من هەژارو برسیەکە بووم، ئەمڕۆ (١٢٠٠٠٠) درهەمم هەیە ئای خوایە گیان!

دەرگاکە ئەکاتەوەو هەژارەکە دەباتە ژوورەوەو بە خێرهاتنی ئەکات

پیّ ی ئەڵیّ: منیش وەکو تۆ هەژارو دەست کورت بووم بەڵام خوای گـەورە ئەمرۆ پیّ ی بەخشیم و پارەکەی لەگەڵ ئەکاتە نیوە، هەژارەکـەش ئـەڵیّ: ئەمە زۆرە تەنها یەك کیسەم پیّ بدە، پیاوەکەش ئـەڵیّ: هـەر ئـەبیّ (٦) کیسەی بەریت (٦٠٠٠٠) درهەمی تیّدایە هەژارەکـەش پارەکـەی بـردوو هاتەوە بۆ لای گەڕاوە، کابرا وتی: کەمـە هەنـدیّکی تـر پـارەت ئـەویّت؟ هەژارەکەش ئەڵیّت: نەوەڵلاّ سوپاس، بەلاّم من مرۆڤ نیم فریـشتەم خـوای گەورە منی نارد تا تۆ تاقی بکاتەوە لەبـەر ئـەم دوو هـەژارەی لـە بـازاڕ لەسەر درهەمیّك بەشەڕ هاتبوون و تۆ یارمەتیت دان، خوای گـەورە (٢٠) قیراتی بە تۆ بەخشی ئەم (١٢٠٠٠٠) هەزارە یەك قیراتـە(١٩) کـەی تـر لای خوای گەورەیە و چاوەڕیّ کە، تا بۆت ئەنیّرم، سبحان الله یەك درهـەم (١٢٠٠٠٠) درهەمە و یـەك قیراتـە (١٩) کـەی تـر لای پـەروەردگارە.

ئازیزان پەندو ئامۆژگاری ئەم چیرۆکە:-

ئەبیّت ئینسان ئاوا بژی ئەگەر بۆ خۆی پیّویستی هەبوو، بەلاّم خەڵك پیّویستر بوون بابیبەخـشیّت (ویـؤ ثـرون علـى انفـسهم ولـو كـان بهـم خصاصة) ئەوان خەڵکی داماوو هەژار و دەست کورتترن، ئینجا ئەبەخشن و ئەڵیّن: با تەنها کیّشەی ئەو چارەسەر بکریّت، بۆ ئیّمەش خوا گەورەیەو یارمەتیمان ئەداتەوە جا پەندیش لەم چیرۆکە کە ئەمانەیە:

یەکەم: ڕەوشتی هەرە بەرزی موسڵمانان بەخشینە ئەبیّ موسڵمان لـە خەمی خەڵکی دابیّت کـە بـۆ خـۆت کـەمیّکت هـەبیّت، بـەلاّم خـەڵکی

پێویست بوون، بیبەخشە خوای گەورە پارمەتیت ئەداتەوە.

دووەم: ئەوەیە ئازیزان ئەو خێزانەی دوو کێشە چارەسەر ئەکەن، گەورەترن لەوەی یەك کێشە چارەسەر ئەکەن، دوو کەس کێشەیان لەسەر ئەم درهەمەیە، یەکێکیش پێویستیەتی بەلاّم دوو مالّی پێ ئاوەدان کردەوە و، دوو کەسی ئاشت کردەوە، جا بەرێزم خوای گەورە پێی بەخشییەوە، برۆ ئەم کێشانە چارەسەر بکە، خوای گەورە چاکەت بۆ دێنێتە رێ و لە دونیا یارمەتیت ئەدا، ئەبێ خوای گەورە لە چ کاتێکی پێویست (١٩) قیراتەکەی تری پێ بدات.

سێهەم: ئینسان هەرگیز خۆی لە بیر نەکات چۆن خوای گەورە ئەمی تاقیکردەوە و هەژارێکی ناردەوە بەر دەرگای، کە چۆن مالّی خۆی لەگەلّ کردە نیوە، نەکەی دەولّەمەند بی و خوای گەورە لە بیر بکەیت، خەلّکی تر بناسە تۆ هەبوونیت و خوا پێداویت، بەلاّم بیرت نەچێت هەر ئەم هەژارو کرێکارەی دوێنێیت، ئەم خەلّکە هەژارە بەسەرکەوە، یارمەتییان بدەو دەستییان بگرە خوای گەورە دێنێتەوە رێت، خێریش ئەگەر کەم بێت بە بچووکی مەزانە پێغەمبەر(ﷺ) ئەفەرموێت: (**اتقوا النار ولو بشق تمرة**) ئەلّێ: خۆت لە ئاگری دۆزەخ بپارێزە ئەگەر بەنیو لەتە خورماش بێت، ئەگەر رۆژی قیامەت تەرازووت بەرامبەر یەك بوون، بەچی رزگارت ئەبێت؟ بەیەك خێری بچووك ئەگەر نیو لەتە خورماش بێت رزگارت ئەبێ و ئەرۆیتە بەهەشت.

چوارەم: پەندی تر ئەوەیە ڕاستگۆیی دوکاندارەکان، لێ ی نەشاردەوەو وتی: کەسێکی تر لەو زیاتری پێ دەدات لەو پارەیەی ئەو کە بە ئەڵماسەکەی دەدات، ئەم ڕەوشت و ڕێکیەی دوکاندارەکان، نەخێر ئەمڕۆ وانییە خۆشەویستان. خۆشەویستان پەندو ئامۆژگاری زۆری تری تیایە بۆ خۆتانی جێ دێڵم، تا چیرۆکی تر بە خواتان ئەسپێرم.

**السلام عليكم ورحمة الله وبركاته**



# بەندیخانە

بسم الله الرحمن الرحيم

الحمد لله رب العالمين الصلاة والسلام علـى حبيبنـا محمـد وعلـى الـه وصحبه اجمعين.

السلام عليكم ورحمة الله وبركاته

ئـازیزان سـەلام و ڕەحمـەتی خـوای میهرەبـان بـڕژێ بەسـەرتاناو ئەپارێینەوەو داوا ئەکەین خوایە گیان لەبەر خـاتری نـاوە جوانـەکانت لـە گوناهەکانمان خۆشبیت، دڵمان بە نووری خـۆت ڕۆشـن بکەیتـەوە، خوایـە گیان بە لیقای خۆت شادمان بکەیت و بـە دینـی پێغەمبەرەکـەت(ﷺ) شادمان بکەیت، خوایە گیان (فردوس الاعلی) شوێنمان بێت و لە ئـاگری دۆزەخ ڕزگارمان بکەیت، پەروەردگار ڕەحمەت و میهرەبانیت بڕژێ بەسـەر ئوممەتی محمد(ﷺ) و پشت و پەنایان بەسەریان بخەو سەرفرازیان بکـەیت، یاأكرم الاكرمين يا رب العالمين امين. ئازیزان خۆشحاڵم پێتـان بگەمـەوە

لە چیرۆکێکی تر پەندوو ئامۆژگاری تر خۆشەویستان بۆ ئەمجارە ئەچینە میسر، کاتبێکی گەورەی میسری هەیە ناوی (**مصطفی الامین**) بۆ خۆی بۆمان ئەگێڕێتەوە و ئەڵێ: لە ساڵی(١٩٦٥) جمال عبالناصر سەرۆکی میسر خەڵکێکی زۆری گرت بەناوی موسڵمانییەوە، خستنیە شوێنێکی زۆر تاریك و لە زیندان و لێدانێکی زۆری لێدان و زۆری ئەشکەنجە کردن، دوایی بڕیارێکیان دا، منو چەند کەسێکیان بردو وتیان: ئەبێت ئێوە لە برسان و تینوویان بمرن.

خستمیانە ژوورێکی زۆر بچووك و تاریك، بەبێ خواردن و خواردنەوە، ڕۆژی یەکەم ئارامم گرت، بۆ ڕۆژی دووەم حاڵم زۆر خراپ بوو، چونکە نەخۆشی شەکرەم هەبوو، دەبوایە ئاوی زۆرم بخواردبایەوە، بەهەر حاڵ تا ڕۆژی دووەم ئێوارەکەی خۆم ڕاگرت، نەمتوانی هیچی تر خۆم ڕاگرم، چووم بۆ (W.C) لەوێ کەمێك میز هەبوو خواردمەوە، هەر چۆن بوو توانیم خۆم ڕاگرم، ئەگەر چی بێتاقەتی خۆم و سوێری میزەکە و زەختیشم زۆرم لە خۆم کرد بەلاّم نەمردم و خۆم ڕاگرت، ڕۆژی سێیەم هات شێت بووم، ئەقڵم ڕۆیی زمانم بە زەوی و بە لێواری خوارەوەی دەرگاکە دادەهێنا ئەم ووت ڕەنگە لەکاتی شووشتنی ئەوێ دڵۆپێ ئاو بە لێواری ئەم دەرگایە دانەهێنا کەوتبێ و بیخۆمەوە تاقەتم نەماو لەو پەڕی بێ هێزی دا بووم، ڕۆژی سێیەم عەسر بوو چاوەڕێی (ملك الموت)م ئەکردو شەهادەم ئەهێنا تا بەرەو قیامەت بڕۆم، لە کاتێکا دەرگا کرایەوە بینم

پەرداخێك ئاوی سارد بەرەو ڕووم دێت، سەرەتا وامزانی خەو ئەبینم دەستم بۆ ئاوەکە ئەبرد ئینجا کابرا دەستی هێنایە پێش، سەرم سورما وتم: ئەبێ ئەمە ئینسان بێ! جنۆکە بێت! یان فریشتەی پەروەردگار بێ!! دەستم بۆ ئاوەکە بردوو دەستم بەری کەوت بینم ئاوێکی زۆر ساردە، کابراش وتی: بێ دەنگبە تا کەس پێ ی نەزانیوە، ئاوەکەم وەرگرت و خواردمەوە لە ژیانما ئاوی وام نەخوارد بووەوە هەستم کرد ئاوەکە ئەچێتە نێو دەمارەکانی لەشم، قەسەم بە خوا گەر یەك ملیۆنم هەبوایە ئەمدا بەم کابرایە، چونکە هەستم بە خۆشی و سەعادەتێکی زۆر کرد، ئینجا تا بەیانی خۆم گرت و بەیانیش سزاکە نەماو هەڵگیرا، بەڵام چەند کەسێك لە ئێمە مردبوون، منیان برد زۆریان لێدام و ئازاریان دام.

شەو بینیم ئەم پاسەوانەی لەلامە، هەمان ئەو گەنجەیە کە پەرداغە ئاوەکەی بۆ هێناوم، بە تەنها لەلام بوو منیش چرپاندم بە گوێ ی دا وتم: بۆ ئەو ئاوەت پێدام نە ئەترسایت دەرت بکەن؟ ووتی: هەر دەرکردن بەخوا لە سێدارەیان ئەدام، وتم: ئەی بۆ ئەم کارەت کرد؟ وتی: مامۆستا ڕاستە تۆ من ناناسی بەڵام من تۆ ئەناسم(٩)ساڵ بەر لە ئێستا چاکەیەکت لەگەڵ ئێمە کرد، هەرگیز لەیادی ناکەم، مامۆستا تۆ سەرۆکی تحلیلی ڕۆژنامەی (اخبار الیوم) بوویت، باوکم چێڵێکی هەبوو چێڵەکەمان مردار بوو، تۆ لە شەوی(لیلة القدر) چێڵێکتان بەدیاری بۆ باوکم هێنا، وتم: من ئەو چێڵەم بۆ ئێوە هێنا؟ وتی: بەڵێ، من خەڵکی فلان شوێنم باوکم (٧) ساڵ

خەریك بوو، هەرچی شتێك هەبوو لە ماڵ فرۆشتی تا چێڵێکی کڕی، (٦)مانگ لامان بوو دوایی مرداربوو باوکم زۆر پەرۆش بوو بۆی زۆر گریا، ئێمەش نامەیەکمان بۆتان نووسی ووتمان: حاڵمان زۆر خراپە، تۆ لەگەڵ هاوڕێکەت بۆ خۆت هاتی و لەشەوی (لیلة لقدر) چێڵێکت بۆمان هێنا من کوڕی ئەو جوتیارەم، جا خۆشەویستان چاکە بکەن بیدەن بە دەم ئاوەوە، ڕۆژێك هەر دێتەوە ڕێت، ئازیزان پەندوو ئامۆژگاری ئەم چیرۆکە:-

یەکەم: هیچ شتێك لای خوای گەورە بزر نابێت (البر لایبلی والذنب لا ینسی والدیان لایموت، افعل ما شئت کما تدین تدان) هیچ شتێ لای خوای بالا دەست بزر نابێت (الذنب لاینسی) چاکە بزر نابێ، خراپە نارزێ و لەبیر ناکرێت (الله) نامرێ چی نەکەی بیکە (کما تدین تدان) چی بکەیت ئەوە دێتەوە ڕێت، چی بچێنیت ئەوە دەدوورێتەوە.

دووەم: خوای گەورە ئەفەرموێت: (وما من خیر فلانفسکم) واتە: هەر چی یەك بکەن بۆ خۆتانە، دێتەوە ڕێتان لە دونیا و ڕۆژی دوایی، ئەم کابرایە چاکەیەکی کرد، هەر لە بیریشی نەمابوو، بەڵام هاتەوە ڕێی، لە ڕۆژێك کە کەس بە کەلکی کەس نایەت، ئەم گەنجە ٩ساڵە ڕەنگ و دەنگی لە بیر نەکرد بوو پەرداخێك ئاوی پێ دا کە نرخی (١)ملیۆن بوو لای مامۆستا مصطفی الامین.

سێیەم: مرۆڤ چەندین نیعمەتی لایە، نازانێ، پێغەمبەر(ﷺ) ئاوێکی ساردی خواردەوە فەرمووی: وەڵلاهی خوای گەورە لە ڕۆژی دوایی

لەم نیعمەتە ئەپرسێتەوە، ئێمە هەر پێشی نازانین.

چوارەم: کاربەدەستانی زاڵم هەر کاتێك بەزین لە گفتوگۆ، دەست ئەکەن بە زیندانی و ئەشکەنجەو ئازار، زاڵمان وا بوون هەر لە فیرعەون تا ئێستاشی لەگەڵدا بێت، ئەوان وا ئەزانن بانگی ئاشتی ئەکەن، ئەگەر ڕاست ئەکەن بابێن بۆ سەر مێزی گفتوگۆ، بزانن کێ لەسەر هەقە؟ کێ داوای ئاشتی ئەکات؟ ئاینی خوای گەورە یان یەکێکی تر؟ بەلاّم زاڵمان هەر وا بوون، ئازاری خواناسان و هەق پەروەرانیان داوە بەلاّم ئەوانەی داوای داوێن پیسی و داوای بێ ڕەوشتی و بەرەڵلاّیی ئەکەن، داوای خاك فرۆشتن ئەکەن، ئازادن و ئەهلی پرس و ڕان (**اخرجوا آل لوط من قريتكم انهم انا س يتطهرون**) ئەوانەی پاکن نیشتمان نافرۆشن، خۆیان نافرۆشن، ئەوانە دەبێت دەرکرێن لە خاك و وڵاتیان، ئەبێ لە کونجی زیندان بن بۆ چی؟ چونکە ئەوانە پاکن نابێ لەگەڵ پیسی بژین.

پێنجەم: ڕەوشتی ڕۆژنامەوانی سەیر ئەکەین کێ برسیبا یارمەتی ئەدا؟ کێ هەژارو کەم دەرامەت بوایە یارمەتی ئەدا. جا خۆشەویستان پەندوو ئامۆژگاری تری زۆری تیایە بۆ خۆتانی جێ دێڵم، بەلاّم لە بیری مەکەن هەر چاکەیەکتان کرد بیدەن بە دەم ئاوەوە، ڕۆژێك دێتەوە ڕێتان. تا چیرۆکێکی تر بە خواتان ئەسپێرم .

**السلام عليكم ورحمة الله وبركاته**




# خوا ئاگاداره

بسم الله الرحمن الرحيم

الحمد الله رب العلمين الصلاة والسلام علـى حبيبنـا محمـد(ﷺ) وعلى اله وصحبه اجمعين

السلام عليكم ورحمة الله وبركاته

خۆشەویستان و ئازیزان ڕۆژووگـران موسـڵمانان، هـەزاران سـەڵات و ڕەحمـەتی میهرەبـانی خـوای گـەورە برژێـت بەسـەرتانا، خوایـە گیـان نەپاڕێمەوە بە ناوە جوانەکانت نەڵێم : **یارحمن یارحیم یاغفور یاکریم یـا حي یاقیوم یابـدیع الـسموات والارض یـاالله** یـاڕەبی خوایـە گیـان لـە گوناهمان خۆشبیت و دڵمان بە نووری خۆت ڕۆشن بکەیتەوە، خوایە گیـان عیبادەت و شەو نوێـژو تویـەکانمان قبـووڵ بکـەیت، پـەروەردگار شـیفای

ئەخۆشەکانمان بدەیت و قەرزی قەرزاران بدەیتەوە بەرەکەت بخەیتە رزقیـان خوایە گیان ئەوەی خەم و پەژارەی هەیە یارمەتی بدەیت یا اکـرم الاکـرم امین.

ئازیزان بۆ چیرۆکی ئەم جارەمان ئەمانەوێت بچین بۆ شـاری موصـڵ، لە ٢٠٠١/٨/٢١ لە شاری موصـڵی خۆمـان ڕوویـداوە، پیاوێـك شـوفێری تەکسییە، بۆ خۆی بە حاڵی خراپی خۆی و ئوتومبێلەکەی بە هەر چـۆنێك بێت بژێوی ماڵ ومنداڵی دابین ئەکات، ڕۆژێك چوار تایەی ئوتومبێلەکـەی پەنچەر ئەبێت و تێك ئەچێت هەر چی ئەکات پـارەی چـوار تایەکـەی بـۆ کۆنابێتەوە بۆی ناکرێت، داوا لە خێزانەکەی ئەکات بچێت لـە لای بـاوکی پارەی بۆ قەرز بکات، ئەڵێ: ئەگەر تایەی نوێ ی لەسەر بێت ئیشم باشـتر بۆ ئەکرێت، ئەگەر لە شەقام لێم تێك بچێت تایەی ترم نی یە و لە شـەقام ئەمێنمەوە، ئافرەتەکەش کە چووە لای باوکی و داوای لێ ئەکات و پێ ی ئەڵێ: بابە گیان زۆر پێویستمان بە کەمێك پارەیە، ئەگەر بتوانی بەقـەرز پێمانی بدەیت تاکو چوار تایـەی پـێ بکـرین، باوکیـشی پارەکـەیان پـێ ئەدات، ئافرەتەکەش پارەکە دێنێتەوە بۆ ماڵ زۆر کەیف خۆش و سـوپاس گوزارن.

بۆ بەیانی پیاوەکە ئەچێت تـاوەکو چـوار تایـەی نـوێ بکرێـت، لـە ئوتومبێلەکەی بخات، لە ڕێگادا ئەڕوات ئافرەتێـك دەسـت ڕائـەگرێت تـا لەگەڵی بڕوات، ئەمیش بۆی ڕائەگریت ئەڵێ: ئەگـەر ڕێگـەی نزیـك بێـت

بابیگەیەنم، ئافرەتەکە دێت و لە پێشەوە دائەنیشێت، شـوفێرەکەش زۆری پێناخۆش ئەبێت، چونکە نەریت وایە، کە ئەگەر ئافرەتێك بە تەنها سواری تاکسی بێت، ئەبێت لە دواوە دانیشێت، لە رێگـادا شـوفێرەکە ئەپرسـێت ئەرۆیتە کـویَ؟ ئافرەتەکـەش ئـەڵێت: هـەر شـوێنێك تـۆ پێـت خۆشـە، پیاوەکەش سەیارەکە ڕائەگرێت و ئەڵێ: دابەزەو پیّ ی ئەڵێ: ئـا ئـەجیب، بیّ شەرم، لەم شارە کەس نەماوە تووشی گوناهی بکەیت، منی بەدبـەخت نەبێت ئەم ئیشە ئەکەیت بۆ ناچی ئیشێکی باش بکەیت؟

ئافرەتەکەش دەستی بەگریان کرد وتی: بـۆ ئـەگریت لەسـەر ئـەوەی گوناه ئەکەیت بە ئەشگریت، ئافرەتەکەش وتی: برا گیان بە خوا مـن بـیّ شەرم نیم و خاوەن ئابڕووم، بەلاّم تۆ نازانی من بـۆ ئەمـەوێت ئـەم ئیشە بکەم؟ تۆ لە ماڵ و حاڵی منـی نازانیـت، مـن بـۆ ئەمـە ئەکـەم؟ مـن مێردەکەم لە قادسیەی سەددام کـوژراوە، ٤ کـچم هەیـە لـە خانوویـەکی خراپ ئەژیم و نازانم چۆن بژێوییان پەیدابکەم ئەم برە پارەیـەی شـەهیدانە پێمان ئەدەن، بەشم ناکات هیچ شوێنێك نی یە تا کاری تیابکەم، بۆیە ئەم کارە ئەکەم، پیاوەکەش زۆری پێناخۆش بور، بـەزەیی پیاهاتـەوەو پـیّ ی وت: ئەگەر تـۆ ڕاسـت بکـەیت، ئێـستا مـن ئـەتوانم یارمـەتیت بـدەم، ئافرەتەکـەش وتـی: وەرە لەگـەڵم تابڕۆینـەوە مـاڵ، حـاڵم ببینـەو لـە دراوسێکانم بپرسە کە من چۆنم؟ بـەلاّم دەسـت کـورتی و نـەداری وای لیّ کردم کە ئەم کارە بکەم، ئەگەر وانەبوو هەق بە تۆیـە، پیاوەکـە لەگـەڵی

چوویەوە بۆ ماڵ و حاڵی ئەمی بینی، ئینجا لەگەڵ خۆی بردی بۆ بازاڕو لێ ی پرسی تۆ چ پیشەیەك ئەزانیت؟ ووتی: من خەیاتی ئەزانم، پیاوەکەش مەکینەیەکی دوورمانی باشی بۆ کڕی لەگەڵ هەندێ خواردن و ئینجا بردیەوە بۆ ماڵ و پێ ی ووت: نە ئەمناسیت، نە ئەتناسم بەلاّم بەڵێن بدە وەها کارێك نەکەیت، جارێکی تر ئافرەتەکەش وتی: بەڵێن ئەدەم هیچ کارێکی خراپ نەکەم و بەرەنجی خۆم مناڵەکانم بە خێو بکەم.

پیاوەکە گەڕایەوە ماڵ ئافرەتەکە وتی: ئەی کوا تایە؟ خۆ هەر تایە کۆنەکانن! ئەمیش ئەڵێ: چووم بۆ لای هاوڕێکەم وتی: دوای دوو ڕۆژی تر تایەی نوێ و چاکم بۆ دێت، هەندێك پارەشتان بۆ ئەمێنێتەوە، هەر ڕۆژێك ئەهاتەوە ماڵ ئافرەتەکە ئەیپرسی کوا تایەی نۆێت نەکریوە؟ ئەمیش ئەی ووت: ئافرەت ئارام بگرە هاوڕێکەم ئەڵێ: تایەی باشمان بۆ دێت، تا ڕۆژێك هاتەوە ماڵ بینی چوار تایەی نوێ و جوان لە ماڵەوەیە سەری سوڕما! وتی: ئافرەت ئەم تایانە هی کێن؟ ئافرەتەکەش وتی: هی خۆمانن پیاوێك هات و ئەم تایانەی هێناو ناو نیشانەکەی خۆی جێ هێشت، زۆر سەری سورما ئافرەتەکەش و وتی: پیاوەکە وتوویەتی سەردانی بکەیت بۆ بەیانی ئەچێت بە دوای ئەم ناونیشانەی کە بۆیان جێ هێشتووە، کە ئەچی سەیر ئەکات کۆمپانیایەکی زۆر گەورەیە جۆرەها تایەی لێ یە گشتی تایەی ناو پاکەت و نوێن! سەلامی کرد فلاّنە کەس کێ یە؟ وتی: فەرموو منم، ئەمیش ووتی: ئەرێ تۆ چوار تایەت هێناوە بۆ ماڵی ئێمە؟ تۆ کێیت؟

ئەی کێ پارەی داوە؟ خاوەن کۆمپانیاکـە لـە شـوێنی خـۆی هەڵـسایەوەو ماچی کردو پێشوازی لێ کرد.

شوفێرەکەش پرسیاری لێ کرد تۆ پێم بڵێ بـۆ ئـەم (٤) تایـەت بـۆ ماڵی ئێمە هێناوە ئەمشەو خەو لە چاوم نەکەوتووە تۆ کێ ی؟ کێ پـێ ی وتی: ئەم تایانە بهێنیتە ماڵی ئێمە؟؟ وتی: برا گیان من خۆم نەم هێناوە، بەڵکو پێغەمبەر(ﷺ) هاتە خەوم و پێ ی وتم: کە چوار تایە بێنمە ماڵی ئێوەو ناونیشانی پێدام من بۆ خۆم نەم هێناوە، بـەڵکو لـە خـەودا پێیـان ووتم: خۆشەویـستان ئەوەیـە خێـر، ئەمەیـە چـاکە تـۆ بیکـە خـواو پێغەمبەر(ﷺ) پێ ی ئاگادارن تۆ هـەوڵ بـدە و هیمـەت بکـە، خـواو پێغەمبەر(ﷺ) پێ ی ئاگادارن پـشت و پـەناتن، جـا خۆشەویـستان بـا پەندوو عیبرەت وەرگرین.

یەکەم: خەم خواردن و بە هانا چوونی ئـەم ئافرەتانـەی ئـەم حاڵـەیان هەیە، ئازیزانم ئەم ئافرەتانەی ئەم کارانە ئەکەن لە بێ شـەرمی و خراپـی خۆیان نییە، مەردی خوا بن بەرەحم و بەزەیی بن، بە ئەقڵ و ژیرانـە ئـەم کێشانە چارەسـەر بکـەن، بـا هەوڵبـدەین بـە بـەزەیی بـین لـە گـەڵیان و یارمەتییان بدەین، ئەم ئافرەتە بۆ یەکەم جار ئەیویـست ئـەم کـارە بکـا، بەڵام دەستی کردۆتە گریان، چونکە کـاری وای نـەکردووەو خـوای گـەورە یارمەتی داوەو رزگاری کردووە، بەرێزان ئەم ئافرەتانە داوێن پاکن، ئەگـەر ئێمـە لـە خـەمی ئـەوان نـەبین، خـەڵکی خـراپ زۆرن ئـەڵێی گـورگن،

گۆشتەکەی ئەخۆن و ئێسکەکەی فڕێ ئەدەن، جا خۆشەویستان هیممەت بکەن.

دووەم: هەر ئیشێك کە ئەیکەیت بۆ خوا بیکە، ئەم پیاوە لەسەر پێویستی خۆی، یارمەتی ئەم ئافرەتەشی دا(وَيُؤْثِرُونَ عَلَى أنفُسِهِمْ وَلَوْ كَانَ بِهِمْ خَصَاصَةٌ) خۆی پارەی قەرز کردووە، بەلاَم هەر یارمەتی ئەم ئافرەتەی دا، پێغەمبەر (ﷺ) ئەفەرمووێت: ﴿انفِق أنفَق عليك﴾ ببەخشە، ئەدرێتەوە پێت. ئەفەرمووێت: ﴿يا بلال انفق ولا تخشى من ذي العرش اقلالاً﴾ ئەی بلال ببەخشەو مەترسە لە خاوەن عەرش، کەمی بکات یا بەرەکەتی لێ ببڕێت.

سێ یەم: پێغەمبەری خوا ئاگادارە بە ئوومەتی خۆی، ئەبێ چەند کەیف خۆشبێت و پێبکەنێ و دڵخۆش بێت، مەردی خوابن دڵی پێغەمبەرەکەتان(سەلامی خوای لەسەر بێت)خۆش بکەن.

چوارەم: هەرکەس دڵی پێغەمبەرەکەی (ﷺ) خۆش بکات، بەڵگەی ئەوەیە لە خوای گەورە نزیك ئەبێتەوە، جا هیوادارم پەندوو ئامۆژگاری تر بۆخۆتان هەڵبژێرن و بیری لێ بکەنەوە، تا دیدار بە خواتان ئەسپێرم.

السلام عليكم ورحمة الله وبركاتة



# خواردنی هەژاران

بسم الله الرحمن الرحيم

الحمد لله رب العالمين. الصلاه والسلام على حبيبنا محمد (ﷺ)وعلى اله وصحبه اجمعين.

السلام عليكم ورحمة الله وبركاته.

ئازیزان و خۆشەویستان، سەلام و ڕەحمەتی خوای میهرەبان بڕژێ بەسەر دڵ و دەروونمان، خوایەگیان لە گوناهەکانمان خۆشبیت، خوایە بۆ خاتری ناوە جوانەکانت، خۆشیمان بدەیت لە دونیاو قیامەت، خواگیان بمانپارێزە لە دونیاو قیامەت. یاڕەبی خوایە گیان لە ئاگری دۆزەخ بە دوورمان بگریت، بەچاوی ڕەحمەت سەیری هەموومان بکەیت و دڵمان بەنووری خۆت ڕووناك بکەیتەوە و یاڕەبی خوایە گیان نەخۆشەکانمان شیفا بدەیت و گەنجەکانمان بپارێزیت و ڕەحم بە پیرەکانمان بکەیت، خوایە گیان ئەوەی دەردەدارە ئاگاداری بیت، خوایە گیان ئەوەی ماڵی پەشێوە یارمەتی بدەیت. .....آمين يا أكرم الاكرمين.

خۆشەویستان شێخێك، زانایەکی لەخواترس هەبوو لە شاری دیمەشق

لە سوریا، ناوی (سەلی مەسونی دیمەشق)ی بوو، ئیمام بوو لە مزگەوتێك لە تەنیشت ماڵەکەی خۆیاندا. رۆژێکیان لە مزگەوت بوو بەر لە نوێژی نیوەرۆ چاوەڕێی نوێژی نیوەڕۆی ئەکرد، هەژارێك هات زۆر پاڕایەوەو زۆر داوای لە شێخ کرد، ئەمیش بە هەژارەکەی وت: هیچت نی یە؟ هەژارەکەش ووتی: نەخێر خوا ئاگاداره (٣٥) ڕۆژه خواردنێکی وامان نەخواردووه چێژی لێ وەرگرین، تەنها خورماو ئاو نەبێ نانیش ئەکرم،ئەم شێخه کە گوێی لێ بوو ئەم پیاوه ماڵ ومنداڵی تەنها خورماو نان و ئاو ئەخۆن زۆری پێ ناخۆش بوو، ئەم لە ماڵەوە خوای گەورە ئەم هەموو نازو نیعمەتەی پێداوە، گەڕاوە ماڵ و وتی: دەرگای حەوشەم کردەوە لە ناو حەوشەکەدا نافورەیەکی بچووك هەبوو، بینیم لەسەر نافورەکە یەك سینی خواردنی زۆر بە تام حازر کرا بوو، تاکو کە من گەڕامەوە نان بخۆین، منیش سەیرم کرد لە ماڵەوە کەس ئاگادار نی یە و خواردنە تازەو بەتامەکەم دا بە هەژارەکە ووتم:

برۆ خوا ئاگادارت بێت، خۆم ئەڕۆیشتمەوە تا ئێوارە ئەم وێرا بڕۆمەوە وتم:

ئێستا بڕۆمەوە لە ماڵێ پێم ئەڵێن: چیت لە خواردنەکە کردووه؟ ئینجا ئێوارە بەترسەوە گەڕامەوە ماڵەوە، بینیم سفرە راخراوەو ئەم هەموو خواردنە خۆشەو چەندین جۆر گۆشت دانراوە! سەرم سوڕما؟ سەلامم کردو هیچم نەوت دانیشتم نانمان خوارد سوپاسی خوای گەورەم کردو وتم:

یا رەبی خوایە گیان لێت بەزیاد بێت ووتم: ئەم هەموو خواردنە خۆشەتان چۆن ئامادەکرد؟ کێ ئامادەی کردووە؟ منالەکان وتیان: باوە گیان ئەم خواردنە خۆمان ئامادەمان نەکردووەو هی خۆشمان نی یە بەڵکو والی دیمەشق دوو میوانی داوەت کردووەو میوانەکانیش نەهاتوونە داوەتەکە و ئەمیش وتوویەتی: ئەبێت هەمور خواردنەکە بۆ ماڵی مامۆستا بەرن ، هەمور خواردنەکەیان بۆ هێناوین، لەبەر خواردنە زۆرەکەی ماڵی والی سینی خواردەنەکەی خۆمانیان بیر چوو بوو، منیش باسی هیچم نەکرد.

ئازیزان خۆتان بیدەن بەدەست پەروەردگار، سبحان الله خۆشت نازانی چۆن بۆت دێتەوە، جا بەرێزان با پەند وەرگرین لەم چیرۆکەدا:-

یەکەم: خۆشەویستان هەرگیز مەترسێن لە خێرو بەخشین خوای گەورە ئەفەرموویت:

**(وما تنفقوا من خير فلانفسكم)** واتە: خێریکەن هەر بۆ ئێوەیە، لە پاداشتی دونیاو قیامەت بۆت دێتەوە، ئەی ئێمە چۆن؟ ئەم ئایەتە جێ بە جێ بکەین**(ويطعمون الطعام على حبه مسكينا ويتيما واسيرا)**.

ئەم خواردنە خۆشە کە هەڵمی لێ هەڵئەستا، بێ هیچ شتێك یەکسەر دای بە هەژارەکە، خوای گەورە چۆن دێلێت ئەزیەت بکێشێت چونکە هێندە بە دڵسۆزی خێرەکەی کرد، جا خۆشەویستان ئەمە نیعمەتی خوایە بەقەد دڵ و نییەتی ئەم پێ ی ئەبەخشێتەوە.

دووەم: سەیر کەن ئەم شێخە رێزدارە حاڵی ئەم هەژارە زۆر کاریگەری

لیّ کرد، ئیّمە رۆژانە هەزار دیّت داوامان لیّ ئەکات هیچ نەبیّت شتیّکی پیّ بدەن مەیگیّرنەوە بە دەستی خالّی، بۆ ئەوەی دلّی خۆشبیّت، چونکە دلّخۆش بوونی ئەو دلّخۆش بوونی تۆیە و خوای گەورە پاداشتت ئەداتەوە لە دونیاو دوارۆژ، وا ئەم شیّخە شتیّکی زۆر بچووکی کردووەتە خیّر کە چی پەروەردگار لەم هەمووەی بۆ ناردۆتەوە، خۆشەویستان خیّری زۆر بکەن و خواردن بدەن بە خەلّکی بالەچیّشتی ئیّوە بخۆن، هەژاریّك وەستا بوو گویّ ی لە پیّغەمبەر(ﷺ) بوو ئەی ووت:

ئەگەر کەسیّك بە خواردنی ئیّوە رۆژوو بشکیّنیّت خوای گەورە رەحمەتی بۆ نەنیّریّت، هەژارەکەش ووتی: ئەگەر ناویش بیّت؟ پیّغەمبەر(ﷺ) ئەفەرمووێ:ئەگەر ناویش بیّت.

بەراستی مانگی رەمەزانە کاتی چاکەیەو ویّستگەی خیّرو خیّراتە، وە لە هەموشیان گرینگتر (ویعطمون الطعام)؛ هەولّبدەن چاکە و خیّر لای پەروەردگار زۆر بکەن، رۆژیّك دیّت هیچ دەست نادات(یوم لاینفع المال ولا بنون الا من اتی الله بقلب سلیم)

واتە: رۆژیّك دیّت هیچ شتیّك بە کەلّکت نایەت، تەنها ئەم دلّە پاکەو نییەتە پاکەکان نەبیّت لەگەلّ خۆمان ئەیبەینەوە، ئەم چاکانەش کە بەر لە خۆمان ناردوومانە، ئازیزانم بە تەمای کورو کەس و کارت لیّمەگەرێ و بۆ خۆت بیکە، تالای خوای گەورە گەورە بیت و لە چاکەکاران بیت.

تا شەویّکی تر بە خواتان ئەسپیّرم

السلام علیکم ورحمةالله وبرکاته



# بەزەیی

بسم الله الرحمن الرحيم

رۆژی پێنج شەممە ۲/۸/۱۹۹۰خەڵکی کوێت لەگەڵ دەنگی تۆپی جەلادەکەی بەغدا بەخەبەر هاتن، ئەبینن وا سوپای عێراق کوێتی داگیرکردووە، هاتنی ئەم سەربازانە حاڵێکی زۆر ناخۆش بوو، بۆ ئەم خەڵکە هەژارو داماوە، بینایان ئەرووخاند، گشتیان وێران ئەکرد، هەرچییان بکەوتایە بەر دەست ئەیانبردوو ئەیانفەوتاند، هەر لەبەر ئەمەشە هێشتا خەڵکی کوردی بەر ئەداوەو هەر فێری ئەم تالانی و بردنەیە، کوردو عەرەب بەلاّم عەرەبەکان زیاتر دەستی تالاّنیان هەبوو بە تایبەت ئەوانەی پلەیان گەورەتر بوو، خەڵکەکە حاڵێکی زۆر خراپیان هەبوو بە کوشتن و تالاّن و ژێر دەستییەوە یەك لەم خێزانانە کە حاڵی زۆر

خراپ بوو ئەگێڕێتەوەو ئەڵێ:

من و دایکم و خێزانم لەگەڵ منالەکان چووینە ناو ئوتومبێل و ڕێمان گرتەبەر تا بە زووترین کات لە کوێت دەربچین، هەر چەند زۆریش شارەزا نەبووم، سەرەڕای ئەم هەموو خالی پشکنینە ڕۆیشتین تا گەیشتینە بیابان هەر ڕۆیشتین هەر چۆلایی بوو، ئەم لاو ئەولاشمان پڕ بوون لە تۆپ و دەبابەو شتی تری جەنگ، تاگەیشتینە سەربازێك لە لای خالی پشکنین کە هات زۆربە توڕەیی و نامەردی هات، زۆر قسەی پێ وتین و ئەزیەتی داین، پرسیمان کامە ڕێگەی سعودیایە؟

دەستی درێژکردو ئیشارەتی کردوو وتی: ئاوا برۆن، ئێمەش لە ترسان بە خێرایی ڕۆیشتین دایکم ووتی:

ڕۆڵە ئاو و خواردنت دابەم سەربازە؟ منیش وتم: دایکە گیان ئێمە دوعا ئەکەین ڕزگارمان بێت، ئەوە ئەڵێ ی چی؟ دایکی ووتی:

نارۆڵە گیان ئەمیش بە زۆری هاتووە بۆ ئەوێ، ئەبێ لە چ حالێك کەس و کاری جێ هێشتبێ بگەڕێوەو شتی پێ بدە، وتم:

چۆن دایکە گیان تا ڕزگارمان بوو چۆن بگەڕێمەوە؟ ئینجا لەبەر دڵی دایکم گەڕامەوە سەربازەکە هاتەوە پێش بەتوڕەییەوە وتی: بۆ گەڕانەوە؟ وتم: هەندێ خواردنمان پێیە حەزمانکرد پێتی بدەین، ڕەنگی گۆڕاو وتی:

کوانێ؟ ئاوەکەی خواردەوە ئێمەی هەر لە بیرنەما ئێمەش ڕۆیشتین سەیر ئەکەم بە دوامان ڕائەکات بانگمان ئەکات و منیش ترسام ڕاوەستام

ووتی:

وەرن برا گیان بەم ڕێیە مەڕۆن، گشتی لوغم و خالّی پشکنینە، بەم ڕێگەیە بڕۆن سەلامەت دەرئەچن تا سعودییە، زۆر سوپاسیم کردو بەر لەوەی، بڕۆین وتی: تۆ یەکەم کەس بوویت خواردن و ئاوت پێدام ئەم ڕێیەی سەرەتا پێشانم دان ڕێیەکی زۆر خراپە، لەبەر خواردن و ئاوەکە دلّم نەرم بوو وتم:

با یارمەتیتان بدەم، ڕێگە سەلامەتەکەتان پێنیشانبدەم.

ئازیزان سەیر بکەن بە چاکە چۆن مرۆڤ دەگۆڕێت، بائەم پەندوو ئامۆژگاریانە وەربگرین:-

یەکەم: بزانن(**ان الله يجزى المتصدقين**) هەر کەس یارمەتی یەکێکی تر بدات خوای گەورە یارمەتی ئەدات، بزانن ئەمانە چ ناخۆشییەك ئەهاتە ڕێیان، مالّوێرانی بوو بۆیان بەیەك پەرداخ ئاوی سارد چۆن سەربازەکە دلّی گۆڕاو ڕێ ی سەلامەتو ڕاستی پێنیشاندان.

دووەم: پێغەمبەر(ﷺ) ئەفەرمووێت: (**والافات واحلكات والاصل في دنيا معروف هم اهل معروف في الاخرة**)نیمامی حاکم ریوایەتی کردووە و ئیمامی ئەلبانی ترحییەتی داوە خۆشەویستان پێغەمبەر(ﷺ) ئەفەرمووێت:

(**صنائع المعروف تقى مصارع السوء**) چاکەکاران ئەپارێزین لەکارەسات واتە: خوای گەورە ئەیانپارێزێ، ئەمانە هەموو ئەمردن،

بریندار دەبوون، بەلاّم یەك پەرداخ ئاوی سارد، پارچە نانێك رێی ئەوانی گۆڕی.

سێیەم: ئازیزان چاکە بکەن، ئەمە دوژمنی بوو، بەلاّم رێی چاکی پیشاندا، چاکە بکە، ئەگەر بەرواڵەت دوژمنیش بێت، بەلاّم دڵی ئەگۆڕێت، ئەگەر مرۆڤ کەمێك مرۆڤایەتی و موسڵمانیەتی تێدا بێت، ئەم نان و ئاوە دەیگۆڕێت، چاکە بکەن ئەگەر لەگەڵ دوژمنیش بێت.

چوارەم: وا مەزانن هەموو کەسێ کەچاکەی لەگەڵ ئەکەی خراپە، ئەم سەربازە خراپ بوو، بەلاّم چاکە وای کرد چاك بێت خۆشەویستانم.

پێنجەم: پەندی تر ئەوەیە ئازیزان بە گوێی دایکتان بکەن، با تاجی سەرتان بێت، لە قسەیان دەرمەچن، ئەگەر بە قسەی دایکی نەکردایە هەمووان لە ناو ئەچوون و بەرەو هەڵدێرو وێرانی، بەلاّم چونکە دایکی باش بوو، دڵی پاك بوو یادی خوای دەکرد، دڵی بەبەزەیی بوو، ئەمەش وایکرد کە خوای گەورە دڵی سەربازەکە نەرم بکات.

تاچیرۆکی تر بە خواتان ئەسپێرم

**السلام عليكم ورحمة الله وبركاته**




# سامان ئەشکەنجەیە

بسم الله الرحمن الرحيم

الحمد الله رب العالمين الصلاة والسلام على خير خلقه وعلى اله وصحبه اجمعين

السلام عليكم ورحمة الله وبركاته

خۆشەویستان ئازیزان ڕەحمەت و میهرەبانی خوای میهرەبان بڕژێ بەسەرتانا، یارەبی خوایە لێت ئەپاڕێینەوە بە ناوە جوانەکانت بە سیفەتە بەرزەکانت خوایە گیان لێمان ببوریت، دڵمان پاك بکەیتەوە، خۆشەویستی خۆت و پێغەمبەرەکەتی(ﷺ) تیا بچێنە، لەو دڵا نەبێت کە جگە لە تۆ کەسی تری تیانی یە، ئەو دڵانەی جگە لە خۆشەویستی خۆت و پێغەمبەر(ﷺ) هیچی تری تیا نییە، یارەبی خوایە گیان لە دایك و

باوکم خۆشبیت خوایە گیان منداڵ داکان صالح بکەی و بەلاّیان لەسەر لابەیت، خوایە گیان بۆ خاتری ناوە جوانەکانت ئەوانەی ڕزقیان کەمەو قەرزارن، بەرەکەتیان بخەیتە ڕزق و یارمەتییان بدەیت.

گەنجەکانمان پارێزراو بکەیت و یارمەتی پیرەکانمان بدەیت، عیبادەتمان قبووڵ بکەیت، **یا اکرم الاکرمین امین.**

خۆشەویستان هەندێ کەس ماڵ و دونیا وای لێ ئەکات بیکاتەبەندەی خۆی، بۆیە پێغەمبەر(ﷺ) ئەفەرمووێت:

**(تعس عبدالدینار و تعس عبد الدرهم)** واتە: بفەوتێت لەناو بچێت ئەوەی بەندەی پارەو دینارە، ئازیزان زۆرن ئەوانەی دەبنە بەندەی دینار و درهەم لە دونیادا، لە ناویان ئەبات و بەرەزیلی ئەمرن و هەم لە قیامەتیش حیساب و وەڵامی پرسیارو حاڵی ناخۆش تووشیان ئەبێت، چیرۆکی ئەم شەومان هی کابرایەکی پیرە دراوسێیەکی ئەگێڕێتەوەو ئەڵێ:

پیاوێکی پیر دراوسێم بوو، نەژنی هەبوو نەمناڵ، نەکەس و خزم و خوێشی سەردانیان ئەکرد، لەبەر ڕەزیلی خۆی دوکانی چاك کردنی پێڵاوی هەبوو، جارێکیان بینیم سێ ڕۆژە دوکانی داخراوەو نەیکردۆتەوە، منیش شێوام وتم:

دراوسێمە بابچم لێ ی بپرسم لە دەرگام دا ووتی:

کێ یە؟ وتم:

منم زۆر بە شێوازێکی ناشیرین دەری کردمە دەرەوە وتم:

کاکە من هاتووم لێت بپرسم بزانم بۆ سێ رۆژە دوکانت داخراوە وتم:
نەکا کێشەیەکت هەبێ؟ وتی:

هیچم نی یە و لێم گەڕێ، منیش ڕۆیشتم دوایی وتم:

ئەو پیرەو نەخۆشە نەوەك شتێکی لێ بەسەر هاتبێ، دەرگاکە کرابوویەوە منیش چومە ژوورەوە هێدی هێدی بینیم لە ژوورەوە دانیشتووەو یەك تەنەکە لیرەی زێڕی هەیە، وتم:

ئەم هەموو لیرە زێڕە جوانەی هەیە، ئێمە خێرمان پێ نەکرد! منیش لەدرزی دەرگاوە سەیرم کرد کاتێك قاپێك لە ڕوونی زەیتی دانابوو بە پارەکانیشی ئەوت:

من ئێوە جێ بێڵم! ئەبێت ئێوە لەگەڵم بێنە ناو گۆڕ، من ژیانم لەسەر ئێوە داناوە، چۆن ئێستا جێتان بێڵم؟ منیش خەریك بوو شێت بم، وتم:

قسە لەگەڵ کێ ئەکات؟ قسە لەگەڵ پارەکانی ئەکات! پارەکانی دانە دانە بەزەیت ئەکردوو ئەیخوارد، لەگەڵ خواردنی ئازاری هەبوو و هاواری ئەکرد تا ئازارەکەی ئەشکا، ئینجا دانەیەکی تری ئەخوارد وتم:

ئەڵێ ی شێت بووە! دەرگاکەم لەسەر داخست و وتم:

بڕە لێرە، دەرگاکەم وا داخست، یەکێکی تر نەتوانێ بیکاتەوە، دوای سێ ڕۆژ هاتمەوە بینیم ڕەق بۆتەوە، سێ ڕۆژە مردووەو ئەستور بووە، دەستم دایێ و بینیم هەر هەموو لیرە زێڕەکانی خواردووەو لە ناو سکیدایە، منیش بە دراوسێکانم وت:

کە فلان مردووە شووشتییان، ئەیان وت:

بۆ ئەوەندە قورس بوو، بەم لاوازیەی خۆی؟ منیش پێدەکەنیم دوایی گۆڕەکەیم نیشان کردوو دوای نیوە شەوێکی درەنگ چەقۆو پێداویستیم برد، چوومە سەر گۆڕەکە هەڵمکۆڵی کفنەکەم دڕاندوو چەقۆیەکم لە سکیدا خواناگادارە تیشکی لیرە زێڕەکان لەگەڵ تیشکی مانگە شەو تێکەڵ ببوو ، دەستم بۆ لیرەکان برد نازانم چی بوو بە دەستمی وەداو لیرەکان ئەوەندە گەرم بوون، لەگەڵ گەرمییەکەی دەستم سووتاو هەندێ لیرە بە دەستمەوە نووسا زۆر ترسام، خێرا خۆڵەکەم بەسەر دا دایەوە، هاتمەوە ماڵ بۆ ماوەی یەك کاتژمێر دەستم لە ناو ئاوی سارد دانا تا ژانی بشکێت، هێشتا ژانی دەستم هەر مابوو.

خۆشەویستانم ئازیزان با پەندوو عیبرەت وەرگرین لەم چیرۆکە...

بۆ کویێ ی کۆکردەوە، بۆ نەیکردە خێرو چاکە، ئەبێت تا قیامەت لە ئازارو مەینەتی دابێت، ئەی لە قیامەت ئەبێ چی بەسەر بێت؟ خوای گەورە ئەفەرمووێت:

**(والذین یکنزون الذهب والفیضة ولا ینفقونها في سبیل الله فبشرهم بعذاب الیم)**

واتە: ئەوانەی زێڕو زیو کۆدەکەنەوەو لە پێناوی خوای گەورەدا نایبەخشن بە فەقیرو هەژاران، مژدەیان بدەرێ بە سزایەکی بە ئازار،(**یوم یحمی علیها في نار جهنم**) ئەم پارەیە سوور ئەکرێتەوە، ئەفەرمووێ

**(فتکوی بها جباههم و جنوبهم وظهورهم هذا ما کنزتم لانفسکم فذوقوا ماکنتم تکنزون)** واتە: پێشیان و پشتییان و تەنیشتیان، بە پارەی خۆیان سور ئەکرێنەوەو سزایان پێ ئەدرێت و پێیان ئەڵێن بیکێشن ئاوا سزایێ کە لە دونیادا بۆ خۆتان کۆتان کردۆتەوە، خۆشەویستان لە کۆکردنەوە بترسەو پێش خۆت بینێرەو جێ ی خۆتی پێ خۆش بکەو ئاوەدانی بکەوە.

ئازیزان پەندوو ئامۆژگاریەکان ئەمانەن:-

یەکەم: سزای دونیا ئاوایە یەکێك ببێتە بەندەی دونیا و دینار**(تعس عبدالدینار وعبدالدرهم)**پێغەمبەر(ﷺ) ئەفەرمووێت:

بفەوتێ و شەرمەزار بێ ئەوەی ئەبێتە بەندەی دینارو درهەم، سەیر کەن ئەمردوو ژیانی کۆتایی ئەهات، بەلاّم نەیتوانی ببەخشێت.

دووەم: هەرچەندە مرۆڤ پیر بێت و بە سالاّ بچێت، حەزی بۆ دونیا زیاتر ئەبێت، پیرە پیاو تۆ کە ژیانت وا کۆتایی دێت و بەرەو ساتەکانی ماڵئاوایی ئەڕۆیت، ئەم پارەیەت ماڵێکی خوای گەورەی پێ دروست بکەیت و ئاوەدانی بکەیتەوەو بیبەخشیت، هەرچەندە پیرە بەلاّم دڵی هەر لای پارەکانیەتی، بۆیە پێغەمبەر(ﷺ) ئەفەرمووێت:

(مرۆڤ پیر ئەبێت، بەلاّم دوو شت لە ناخیدا هەر بە گەنجی ئەمێنێتەوە**(الامل والحرص)** هیوابوون بەژیان و مانەوەشی لە ژیانداوە هەروەها ڕەزیلی.

سێیەم: ئەگەر مرۆڤ ڕەزیل بوو ئاوا ئەیکوژێت و لە ناوی ئەبات،

کەسێك ماڵی خۆی نەخوات و نەیکوژێ ئەوا ئەو ئەیکوژێت، بیکوژە بەر لەوەی بتکوژێت، لە پێناوی خوای گەورە بیبەخشە ئەگەر نا ئەو ئەتکا بە قوربانی و لە قیامەت سزات ئەدات، جا ئازیزان با سامانەکەمان نەبێتە ئامێرێکی سزا لە دونیا و دوارۆژ، ببەخشین و بەهەشتی پێ بکڕین و خەڵکی پێ دڵشاد بکەین و خەڵك خێر لە پارەکانمان ببینێت.

تا چیرۆکی تر بە خواتان ئەسپێرم

السلام علیکم ورحمة الله وبرکاته




# ئەو کەسەی چاڵ لێ بدا، خۆی دەکەوێتە ناوی

بسم الله الرحمن الرحيم

خۆشەویستان.... زۆر کەس هەن خۆشی و جوانی دونیا وایان لێ ئەکات ستەمی زۆر گەورە بکەن، خیانەت بکەن، گوناهی زۆر گەورە بکەن، ئازیزان بۆ پەند وەرگرتن ئەچینە لای پیاوێکی بازرگان، ئەم پیاوە بازرگانی بە چێڵ ئەکات لە تورکیاو سوریا ئەیکڕێت و بۆ ئێران یان لە ئێران و تورکیا بۆ سوریا ئەیبات، گوێگرن بۆ ئەم ڕووداوەی کە بەسەریا هاتووە ئەڵێ: چێڵێکی زۆرم پێ بوو لە (حەلەب)

ئەگەڕامەوە بۆ (موصل) بەفرێکی زۆر کەوتبوو، حاڵم خراپ بوو، هەموو چێڵەکانم مرداربوون، تەنها چواریان مانەوە، بەهەر چۆنێك بوو گەیشتمە لادێیەك، بەڵام کە لەڕێ چێڵەکان ئەمردن، منیش جێم ئەهێشتن نەمئەزانی چییان لێ بکەم، لە دێیەکە لە دەرگایەکم دا و دەرگاکەیان

کردەوە، بردمیانە ژوورەوەو خزمەتی زۆریان کردم و شـوێنی ئاژەڵـەکانیان کردەوەو ئالیکیان پێ دان، ئەوان دایك و باوك و منالێکی شەش سالأنیان هەبوو، شەو دانیشتین قسەمان ئەکردوو باسی خۆمم کردو وتم:

من بازرگانم و خوای گەورە تاقی کردمەوتەوە، کەوام بەسەر هـاتووە، دوو ژووریان هەبوو منالەکەیان چوو لە ژووری نوستن خەوت ئینجـا چـووم خەوتم، شەو ئافرەتەکە بە پیاوەکەی ئەڵێت:

بۆ نایێیت من و تۆ کارێك بکەین، ئەڵێ چی بکەین؟ ئـەڵێ وەرە بـا ئەم پیاوەی میوانمانە بکوژین، ئاخر ئافرەت شورەییە ئەوە میوانمانـەو لـە خوا بترسە، ئەمانەتە دەبێت رێزی بگرین، خۆ تـۆ ئـەزانیت ئـەم زسـتانە تەنها کەمێك ئازووقەمان هەیە، هـی چـی تـر، چـێلەکانمان بـەژێر بـەفر کەوتوون، وەرە با بیکوژین و سەری ببڕین، فرێ ی دەدەینە ناو ئەم دۆلأنە، ئەگەرلە ئێمەشیان پرسی ئەڵێین نایناسین و ئـەمان بینیـوە چـوار چـێڵ و هەندێ پارەشی پێیە ئێمە پێویستمانە لەبەر خـاتری ئـەم منالـە، واز لـە پیاوەکە ناهێنێت، تا بڕوای پێ ئەهێنێ کە بیکوژێ ، پیاوەکە ئەڵێ چۆن؟ وتی: زۆر ماندووە، تا درەنگە شەو ڕاوەستە، جا خـۆت بپۆشـەو دەچـینە ژوورەوە، خەوی لێکەوتووەو ئاگاداری نابێتەوە. چوونە ژوورەوەو ئافرەتەکە قاچی گرت و پیاوەکەش ئەرمایی ملی گرتو سەری دەبڕن سبحان الله! بـێ ئەوەی سەیری بکەن، کە تەرمەکەیان هێنایە دەرەوەو دوایی سەیریان کـرد ڕاست بوورانەوە. کوڕی خۆیان سەربڕی بوو بەدەستی خۆیان. ئەوان چەندین

ساڵە ئەم کوڕە تاقانەیان هەبوو،بزانن خوای گـەورە چـی کـردووە، کاتێـك ئـەوان دانیـشتبوون منالّەکـە چـوو بخـەوێ و سـەیری کردبـوو، جێگـای میوانەکە نەرم ترە لەوێ خەوتبوو. کە میوانەکـە چـووە ژوورەوە بخـەوێ، سەیری کرد منالّەکە لە شوێنی ئەو خـەوتووە. ئـەمیش لەسـەر جێگـەی منالّەکە خەوت و دڵی نەهات خەبەری بکاتەوە.

خۆشەویـستان ئەمە کۆتایی هـەموو کەسـێکە کـە خیانـەت بکـات. ئەوان چۆن میوانیان کردە ئامانج، بەلاّم کوڕەکەیان کوشـت. هـەتا مـاون بەو داخەوە حەسرەت دەکێشن و لە قیامەتیش خوای گەورە چەندین سزای داناوە بۆیان.... ئازیزان با پەند وەرگرین.

یەکەم: (ان الله یسمع ویری) ئاگاداربە هەر کارێك ویـستت خیانـەتی تێدا بکەی، خوای گەورە دەبینێ و دەبیسێ و ئاگادارە، لەترسی خوا ئـەم کارە نەکەیت.

دووەم: هەرکەسێك ویستی زوڵم بکات، ئەوا خۆی تێنەکەوێت. ئەگەر کەسێك ویستی خیانەت بکـات، ئـەوا سـزا دەدرێ و مـاڵی خـۆی وێـران دەکات.

سێ یەم : تۆ بەحەلاڵی داوا لە پەروەردگار بکەو خوای گەورەش خۆی ئەتداتێ و هەرگیز داوای حەڕام مەکە. ئەم پیاوە ویـستی ئەم سـامانە لـە میوانەکەی ببات، بەلاّم ئەم سزایەی بینی .

چوارەم: میوان ئەبێ ئاوابێ و ئەرکی بەسەر خاوەن مـاڵ زۆر نـەبێت.

ئەم میوانە چوو تا منالّەکە لاببات و بیخاتەوە سەر جێگەی خۆی بەلاّم دلّی نەهات خەبەری بکاتەوە.

پێنجەم: ئافرەتی خراپ کارەساتە. ئەم ژنە چونکە ناوەوەی خراپ بوو، وایکرد پیاوەکە بەدەستی خۆی منالّەکەی سەر ببڕێت. ئەگەر ئەم ئافرەتە وانەبوایە، ئەم پیاوە هەر بیریشی نەئەکردەوە لەم جۆرە کارانە بەلاّم سەیرکەن پێغەمبەر (ﷺ) ئەفەرمووێت: ﴿**اتقوا الدنیا واتقوا النساء**﴾ واتە: وریا بن لە ئافرەتان. ئافرەتەکە ئەبوایە نەهێلّێت پیاوەکەی وەها کارێك بکات، بەلاّم ئافرەتەکە وایکرد پیاوەکە ئاوابکات.

خۆشەویستان حەزدەکەم زیاتر پەندوو ئامۆژگاری لیّ وەربگرن، بەلاّم بزانن کۆتایی خیانەت هەرناخۆشیو هیلاکییە تا چیرۆکی تر بەخواتان ئەسپێرم. السلام علیکم.




# هیچ شتێك بێ حیكمەت نییە

الحمد لله رب العالمين. الصلاه والسلام على حبيبنا محمد (ﷺ)وعلى اله وصحبه اجمعين.

السلام عليكم ورحمة الله وبركاته....

ئازیزانم ..بەڕێزانم ..ڕەحمەتی میهرەبانی خوای میهرەبان برژێت بەسەر هەموومانا. یاڕەبی خوایە لێت نەپاڕێمەوە بەناوە جوانەکانت، بەسیفەتە بەرزەکانت لەگوناهمان خۆش بیت، خوایە گیان بەندەی زاڵم و ستەمکارین، تۆ لێمان خۆشببە. خوایە گیان سنوورمان بەزاندووە بەلاّم تۆ غەفورو ڕەحیمی.. هەرچەند تاوانمان زۆر بێت، لێبوردەیی تۆ گەورە ترە، یا ڕەبی ڕەحمەتت زۆرە بێبەشمان مەکەو ڕەحمان پێ بکەی. خوایە پاکمان بکەیتەوەو دڵێکی پاکمان پێ ببخشیت، ببێتە شوێنی زانست و ئیمان، دڵێکی زیندوومان پێ ببەخشە، دڵێك تا قیامەت دەستمان بگرێت. ئەو

دڵەی بەیادی تۆ نەبێ بە هیچی تر ئارام نابێت. خوایە ڕەحم بە دایك و باوك و منداڵەکانمان بکەیت.خوایە گیان لە خزم و کەسمان خۆشبیت و عیبادەتمان قبووڵ بکەیت، خوایە نەسرەتی موسڵمانان بدەیت، موسڵمانان کەسی تریان نییە جگە لە تۆی میهرەبان، پەروەردگارا بۆ خاتری ناوی بەرزو پیرۆزت، لوتف و ڕەحمەتی خۆتمان پێ ببەخشە.امین یا اکرم الاکرمین.

خۆشەویستانم ... کەشتێك ڕوو دەدات زۆر دڵمان پێ ی ئەتەزێ، بۆی دڵگران ئەبین، بەڵام ئەگەر تۆزێکی لێ ورد ببینەوەو ئارام بگرین، دەبینین چ خێرێکی تێدابووە، نەك هەر ئەمە، بەڵکو چ بەڵایەکی زۆر گەورەشی لەسەر لابردوویت. کەس نی یە تاقی نەکرێتەوە، دڵی ناخۆش نەبووبێت، بۆ پەند وەرگرتن گوێ گرن لەم چیرۆکە.

ئافرەتێك هەبوو ماستی دەفرۆشێت وەك گشت ئافرەتەکانی تری کوردەواری بەیانیان زوو لەگەڵ ئۆتۆمبێل دێت بۆ شار بۆ ئەوەی ماستەکەی بفرۆشێت.

شەو هەموو ماستەکەی هەوێن کردوو داپۆشی، بەیانی کە هەڵسا ماستەکەی ئامادە کردوو بەرەو شار هات بۆ ئەو شوێنەی کە لێی دا ئەبەزێت، لای دوکانێك ماستەکەی داناو چاوەڕێی ڕەحمەتی خوای میهرەبانی دەکرد ماستەکەی فرۆشت، یەك جام ماستی مابوو وتی : الحمد لله کە ئەوەندەم ماوە، چاوەڕێ بوو بیفرۆشێت لە بیری خۆی دا ئەی وت:

خوایە گیان کڕیارێك بنێریت، ئەم ماستەم لێ بکرێت، نەی بەمەوە ماڵ، چووە لایەکی تر سەمووونی کڕی و بە ناو ئەیخوارد، پیاوێك هات و زۆر تەواو دیار نەبوو، ماستەکەی تام کرد، ئافرەتەکەش هیچی بە ڕووی خۆی نەهێنا وتی: ئێستا ئەیکریت، ئەویش ماستەکەی کردەوە(لاحیاء في طلب الدین)میزێکی تێکرد، ئافرەتەکەش زۆر توڕە بوو، کردیە دەنگە دەنگ و خەڵکی بانگ کرد، پیاوەکە شێت بوو هیچی نە نەکرد، بەڵکو تەنها پێدەکەنی، پیاوێکی تریش بەو شوێنەدا ڕەت بوو وتی:

ئەمە چی بووە، وتیان: ئەم شێتە وەها کارێکی کردووە، پیاوەکەش خوا پێداو بوو، هەقی ماستەکەیداو بە ئافرەتەکەی وت:

بڕۆ بیرێژە، دەستی کردە ملی شێتەکەو وتی: جارێکی تر کاری وا نەکەیت و هەندێ پارەی پێدا، ئافرەتەکە چوو ماستەکە بڕژێنێت، بینی مارێك لە ناو ماستەکە خۆی لولداوەو تۆپیوە، ئافرەتەکە زۆر سوپاسی خوای کرد، کە نەیفرۆشتووەو ئەم شێتە ئەم کارەی کردووە.

خۆشەویستان پەند وەرگرین:-

یەکەم: ئەم گەردوونە بەبێ خاوەن نی یەو خوا یەکی کارساز نەیسوڕێنێت و ، ئەم کارانە بەڕێوە نەبات، هەموو کارەکان لە شوێنی خۆیەتی و ڕێکخراو و جوانن(**فارجع البصر هل ترى من فطور ثم ارجع البصر كرتين ينقلب اليك البصر خاسئا وهو حسير**) هیچ شوێنێکی دونیا نادۆزیتەوە کەم و کوڕیەکی هەبێت و هەمووی پڕ حیکمەت و پڕ

فەلسەفەو تەواون ئەمە حیکمەتی پەروەردگارە، دروست کراوی ئەمە، هەموو بوونەوەر لە ژێر سیستەمێکی حەکیم دایە، ئەمیش(الله) یەو بەڕێوە دەچێت.

دووەم: هەموو کارێکی خوای گەورە حیکمەتێکی تێدایە، بە ئەقڵی کەمی من دەرکی پێنەکات و نەزانێت، کە ئەم شێتە هات و وای کرد کێ ئەیزانی ئەمە وادەکات و ئەم ماستە مارێکی تێدایە، ئەگەر ئەم ئافرەتە ئەم ماستەی بفرۆشتبایە چی ڕوویدەدا؟ خوای گەورە ئەم ئافرەتەی پاراست چونکە یادو زکری خوای گەورەی نەکردوو، بە هەوڵی خۆی نانی پەیدا دەکرد، بۆیە خوای بالآدەست پاراستی.

خۆشەویستان هیچ کارێکی خوا بەبێ حکمەت نییە، ڕاستە ئەم شێتە بە ئەمری خوا هات.

سێیەم: لە هەر کارێك و ڕووداوێك سوپاسگوزاری بکە، چونکە خوای گەورە ئاسانی دەکات، وەکو کاری ئەم ئافرەتە، بۆیە خۆشەویستان خۆتان بدەن بەدەست خوای بالآدەست و ئەمیش دەتانپارێزێ، پەروەردگار بە شێتەکان دەتانپارێزێ، نەك بە ئاقڵەکان، بەشێتەکان دەتانپارێزێت لە دەستی ئاقڵەکان .

السلام علیکم ورحمة الله وبرکاته




# ئەوليا نەمێنێت، دونياش نامێنێت

بسم الله الرحمن الرحيم

الحمد لله رب العالمين والصلاة السلام على حبيبنا محمد(ﷺ) وعلى اله وصحبه اجمعين.

ئازيزان و بەڕێزان ڕەحمەت و ميهرەبانى ئازيزو پەروەردگارمان بڕژێ بەسەر دڵ و دەروونتان.

يارەبى لێت ئەپاڕێينەوە بەناوە جوانەكانت يارحمن يارحيم ياغفور ياكريم ياحى ياقيوم يابديع السموات والارض ويالله يالطيفا بخلقه ويا خبيرا بخلقه ياعليما بخلقه الطف بنا يااكرم الاكرمين، يارەبى خوايە گيان لە گوناهەكانمان خۆشبيت، ئەو دڵەمان ڕووناك بكەيتەوە، لە خەم و پەژارە بمانپارێزى ئيمانمان سەلامەت بكەيت، بە موسڵمانى بژين و بمرين و

بژێینەوە، خوایە گیان شەرەف وکەرامەتی ئومـەتی محمـد(ﷺ) بپـارێزی خوایە گیان ئومەتی محمـد(ﷺ) هـاوارو نالـەیان دێ، بـەهانایان بێیـت، خوایەگیان لە ئاگری دۆزەخ بمانپارێزی و بەهەشتمان بە قـسمەت بکـەی و لەگەڵ خۆشەویستان و پێغەمبەران(دروودی خوایان لەسـەر بـێ)و یـارانی حەشرمان بکەیت، **یا اکرم الاکرمین**

خۆشەویستان خەڵکی لە بازاڕو مزگـەوت و شـوێنەکانی تـر دەبیـنین هەژارەو ڕیزێکی وای ناگرین، کەشایەنی ئەو بێت، زۆر جـار ئـەولیای زۆر گەورە لەبەر ئەوەی شەرمیان هەبووە، خەڵك لە دانیشتن و کۆڕەکان ڕێزیان نەگرتوون، بەڵام ئەوان لەبەر سەفای خۆیان و ڕووناکی دڵیان، حـەزیان لـە خۆدەرخـستن نـەبووە، لەهـەر شـوێنێ خۆیـان نـەناس کـردووە، حـەزیان نەکردووە، خەڵکی بزانن ئەوان ئەولیان، خۆیان بـە گـەورەتر لـە خـەڵکی نەزانیوە.

دەچین بۆ تورکیا باسی ئەولیایەك ئەکەین:

بەڕێزان یەکێك لە زاناکـانی تورکیـا، خـەڵکی شـاری قەیـسەر بـوو ناوی(حامید ئابەرد ئیلـی) بـوو، ئەمـە زانایـەکی زۆر گـەورە بـوو، زۆر گەڕابوو بۆ زانست و خوێندن، چووبوو بۆ حەلەب، تەبرێز، شاری ئـەردبیل لە ئێران، لە لای شێخی عەلائـەددین ئـەردەبیلی بـوو لـە خزمـەت ئـەو زانایەدا بوو تاکو مرد، خزمەتی کردووەو زۆری زانست لێ فێر بـووە، زۆر شارەزا بوو، لەزانستی تەسەووف، ئەم زانا بەڕێزە هاتە شاری بۆرسـە کـە

پایتەختی دەوڵەتی ئیسلامی بوو لە زەمانی بایەزیدی یەکەم، لەوێ سەموونی ئەفرۆشت بەگەڕەکەکاندا، ئەم زانایە لای منالەکانیش بە(سەموونچی بابا) بانگیان ئەکرد، کە لە کۆڵان دیار ئەکەوت منالەکان ئەیان ووت:

دایکە، باوکە، سەموونچی بابا هاتووە، پیاوێکی نەرم و نیان بوو، ریشێکی سپی و ڕوویێکی جوان و نوورانی هەبوو، ئەو سەموونەی کە ئەیفرۆشت زۆر خاوێن بوو، لەم کاتەدا بایەزیدی یەکەم: ویستی مزگەوتێکی زۆر گەورە لە بۆرسە دروست بکات ئێستا بە(الجامع الکبیر)بە ناوبانگە، کرێکارەکان هەموو ڕۆژێ سەموونیان لەم پیاوە ئەکڕی، مزگەوت تەواو بوو، خەلیفە خۆی هات و مزگەوت کرایەوە، فەرمانی بە ئەمیری سوڵتانکرد کە زانایەکی زۆر گەورەو ناسراو بە ئەمیری سوڵتان، خەلیفە پێی ووت: ووتاری هەینی بدات، وتی:

باشە، ڕۆژی هەینی هەموو خەڵك دانیشتوون، ئەم زانایە کە ئەمیری سوڵتان، خەلیفە پێ ی فەرموو: کە هەڵسێتو وتار بدات، هات لە تەنیشت مینبەر دانیشت و سەیری خەڵکەکەی کرد، وەك ئەوەی بەدوای سەموونچی بابا ئەگەڕاو ئەیزانی چ زانستێکی هەیە، بەلاّم خۆی دیار ناخات. ئەم زانستەی بۆ ئەوەیە، عیبادەتی پێ بکات و خوای گەورەی پێ بناسێ.

بینی لەناو خەڵکەکە فەرمووی: شێخ حامید فەرموو، خەڵك ئەیان

ئەناسی ئەیان‌و وت: ئەبێ کێ بێ؟ بینییان سەموونچی بابا هەڵسایەوەو چووە پێشەوە، وتی: خەڵکینە وەڵلاّ لەم شوێنە لەو شایستە تری تیا نییە، کە ئەم‌و وتارە بخوێنێتەوەو ئەبێ ئەم‌و وتار بدات.بەلاّم سەموونچی بابا حەزی نەئەکرد بخوێنێتەوە.بە ئەمیر سوڵتانی وت: تۆ بۆ منت ئاشکرا کرد؟ وتی: ئەبێ ئەمرۆ ئاشکرا بیت. تاکەی ناتەوێ خۆت ئاشکرا بکەی و خەڵك ڕێزت نەگرێ. زۆر ئارامم گرت، بۆ ئەوەی ئاشکرات نەکەم.

مامۆستا فەناری زانایەکی دەوڵەتی عوسمانییە ئەڵێ : بەسەر دوانگە کەوت وەکو شێر تەفسیری سورەتی (الفاتحە)ی کرد، ئەقڵ و مێشکی ئەوانەی دانیشتبوون هەمووی ڕاگرت.حەوت جار تەفسیری سورەتی (الفاتحە)ی کرد. جاری یەکەم هەموو خەڵکەکە تێی گەیشت، تەفسیری دووەم هەندێ تێیگەیشتن، تەفسیری سێ یەم هەندێکی کەم تێیگەیشتن، تەفسیری چوارەم هەندێکی زۆر کەم تێیگەیشتن، تەفسیری پێنجەم و شەشەم و حەوتەم هیچ کەس لێی تێنەگەیشت تەنها خۆی نەبێت.

دوایی هاتەخوار. بایەزید خەریك بوو شێت بێت، وتی: چۆن لەدەوڵەت و پایتەختی من کەسی وا هەیەو بەمنی ناناسێنن؟ وتی: قوربان خۆی خۆی نەناس ئەکات و سەموون ئەفرۆشێت.سەموونچی بابا وتی: قوربان واباشە بڕۆم. دوایی چوویە ماڵ و خەڵك نانی خواردو ویستییان بڕۆن دەستی ماچ بکەن، دوعایان بۆ بکات، بەلاّم خێرا ڕۆیشتبوو، کەس نازانێت چوو بۆ کوێ؟!

ئازیزان باپەند وەرگرین......

یەکەم: زانای ڕەببانی ئەبێ ئاوابێت، نانی بەدەستی خۆی پەیدا بکات (الذین لایملکون قوتهم، لایملکون قرارهم) ئەوەی خواردنی بەدەستی خۆی نەبێت ئەوا بڕیاریشی بەدەستی خۆی نییە. خۆزگە هەموو کەس نانی بەدەستی خۆی پەیدا ئەکرد، بۆ ماڵ و منداڵی خۆی، لەکەسیش شەرم نەکات. کەسی ئەولیا ئاوایە، سیفەتی خۆی دەرناخات ....بینیوتانە مامۆستایان لە ڕیزی پێشەوە دانیشتوون، بەڵام ئەولیا لە هەر شوێنێ بێت دائەنیشێت. پێغەمبەر (ﷺ)باسی خەلکی بەهەشت ئەکات(انقیاء اتقیاء اخفیاء)پاکن و موتەقین و کەسیش نایان بینێت. کەدێنە ناو خەلك کەس لێیان ناپرسێت و ڕێزیان ناگرێت، کە دیاریش نین، دیسانەوە کەس لێیان ناپرسێت و گرنگیان پێ نادات(رب اشعث اغبر مترددون علی ابواب اؤلئك لو اقسم علی الله لابره) پێغەمبەر (ﷺ) ئەفەرمووێت: پیاوێکی غەریبی تۆزاوی(مترددون علی ابواب) بچێتە بەر هەر دەرگای ماڵێك دەری ئەکەن(اؤلئك لو اقسم علی الله لابرة)هەموو شتێك داوا بکات، خوای گەورە بۆی جێ بەجێ ئەکات.بلێ: خوایە ئاوەها بکە ، ئەیکات. بلێ خوایە سوێند بە عیزەتی تۆ ئەبێ ئەم کارە بکەی وئەیکاو و ئەگەر سیستەمی هەموو بوون ڕابوەستێ.

خۆشەویستان ئەولیا خۆی ناڵێ من ئەولیام و من ئاوام و من ئاوام ، من زانام.... خۆشەویستان سیفەتێکی تری وەکو ئەو شێخانە نابێت بە

زانین مەغرور بێ، دەبێ متوازع بێ. دار هەرچەند گەورە بێت لقی زیاتر ئەبێ و شۆڕ ئەبێتە خوارەوە، بەلاّم ئەگەر بێ بەر بێت لقەکانی بلّند ئەبێ.

مرۆڤ هەرچەند زانستی هەبێ، نابێ بەرەو خوار بێتەوە، متوازع دەبێ و بێ دەنگ دەبێت و ملکەچ دەبێ، بەلاّم ئەگەر زانستی پێنەبێت ئەوا تەکەبورو خۆبەگەورە زانی دەیگرێ.

دووەم : ئازیزان.... ئەبێ ئێمە رێزی زاناو مامۆستاکان بگرین. هەندێ لە مامۆستاکان هەژارن، ئەبێ رێزیان بگرین. خۆشەویستان.. ئەو زانایانەی ئێستا چارەکی ئیمامی (ئەبوحەنیفە)زانستییان پێنیە بەلاّم ئەو جلو بەرگانەی لەبەر ئەوان بوو زۆر کۆن بوو، بەلاّم هی ئێمە جوانن، خاوێنن.بەرێزانم بە جلو بەرگ نییە بەلّکو بە دلّ و دەروونە. ئازیزانم ئەو زانایانەی کە رێزیان ناگیرێت لەلامان، لای پەروەردگار زۆر گەورەن، پلەیان بەرزە، رێزیان بگرن تاخوای گەورە رێزتان بگرێ. تا چیرۆکی تر بەخواتان ئەسپێرم.

السلام علیکم ورحمة الله وبرکاته.




# مۆڵەتی قەرزدار

بسم الله الرحمن الرحيم

الحمد لله رب العالمين. الصلاه والسلام على حبيبنا محمد (ﷺ)وعلى اله وصحبه اجمعين. السلام عليكم ورحمه الله وبركاته.

ئازیزان باهەرگیز مرۆڤ مەغرور نەبێت بەوەی کە خوای گەورە پێی ئەدات، چونکە نازانێت چۆن لێی ئەسەنێتەوە. ئێستا هەبوونیت، تەندروستیت باشە، لە خۆشیدا ئەژیت، بزانە کە لە تاقیکردنەوەی پەروەردگاریو وریای خۆت بەو ئاگادار بە، چونکە خوای گەورە ئەتبینێ و ئاگادارە تابزانێ چۆن ئەم نیعمەتەی ئەم بەکاردێنی، هەرگیز کارێکی پێچەوانەی شەرع نەکەیت و شتێکی خراپ نەکەیت، ئەگەر کەمترین هەڵەو خراپە بکەی خوای گەورە سزات ئەدات.. چیرۆکی ئەم شەومان:-

پیاوێکی هەژار لە مانگی ڕەمەزان هەندێ پارەی لە پیاوێکی

دەوڵەمەند وەرگرتووە، کە بۆماوەیەکی کەم بیداتەوە، چەند هـەوڵ دەدات پارەکەی بداتەوە، دەوڵەمەندەکەش هـەواڵی دەداتـێ پارەکـەی بداتـەوە ، ئەویش دەچێتەوە لای و تکـای لێ دەکـات، بـەلام دەوڵەمەندەکـە ئـەلێ نەخێر ئێوارە دێم و پارەکەم ئامـادە بکـە. ئێـوارە دانیـشتوون تـا ڕۆژوو بشکێنن، هەندێ نانی ڕەق و شۆرباى نیسکیان داناوە، کەچی ماڵـەکانی تر چەندین جۆر خواردن و شیرینی و گۆشتییان داناوە، کـەس ئاگـای لـەم ماڵە نییە، هەژارو خەمبار دانیشتوون، پیاوەکەش بیر ئەکاتەوەو ئەڵێ:

خوایە گیان چی بکەم؟ ئێستا پیاوە دەوڵەمەندەکـە دێـت؟ تـۆزێکی ماوە تـا بـانگ بـدات، دەوڵەمـەنـدە، هـات و بەهەژارەکـەی وت : کـوا پارەکەم؟زۆر قسەی ناشیرینی پێ وتوو جوێنی پێدا. ئەویش وتـی: بـەخوا پێم پەیدا نەبوو، تەنها یەك هەفتە مۆڵەتم بدە، لەناخی زەویش بـێ بـۆتی دێـنم. دەوڵەمەندەکـەش وتـی: ئـەزانی زۆر نامـەردی، کەوتـە گیـانی و لەبەرچاوی منداڵەکانی لێیداو تفی لێ کـرد، منداڵەکانیـشی دەسـتیان بـە گریان کردوو ئەیان ووت: لێی مەدە، دەوڵەمەندەکەش وتـی: هەفتەیـەکی تر دەمەوێت و ڕۆیـشت.هەژارەکـەش دەسـتی بـە گریـان کـردوو بـانگی ئێوارەشی داو وتی: بڕۆ خوای گەورە تۆڵەت لێ بسەنێتەوە.

دوای دە ڕۆژ ژانێك لە قاچی پەیدا بوو، ئارامی لێ هەڵگرت، چـووە لای دکتۆر، وتی ئەمرەتانی گرتـووە ئـەبێ بیبڕینـەوە، دوای دە ڕۆژی تـر قاچەکەی تر ژانی گرت و دکتۆر وتی: ئەمەشیان سەرەتانی گرتـووە دەبـێ

بیبڕینەوە، چۆن بەقاچەکانی کەوتە سەر هەژارەکە و لێی دا ئاواش خوای گەورە تۆڵەی لێ کردەوەو پێغەمبەر(ﷺ) ئەفەرمووێت: (اتقوا دعوة المظلوم) واتە: ووریا بن لە دوعای ستەم لێکراو، چونکە هەر حەوت ئاسمانەکان دەبڕێت، تا ئەگاتە لای پەروەردگار.(فاعتبروا یا اولی الابصار) ئەوانەی مەغروورن، ئەوانەی زۆردارن، ئەوانەی خواپێداون با پەند وەرگرن.....

ئەوەی کە قەرزی لایە وازی لێ بێنن، تاکو پەیدای دەکات. پێغەمبەر (ﷺ)دەفەرموێت: ﴿پیاوێکی خواپەرست نەبوو، بەلام بە کوڕەکانی ئەوت ئەگەر خەڵك هاتنە لاتان شتتان لێ بکڕن، پارەی هەبوو لێی وەربگرن، ئەگەر نەیبوو بەقەرز پێی بدەن ، ئارام بگرن تا دەیداتەوە، ئەگەر هەر نەیبوو بیبوورن. خوای گەورە پێی فەرموو، تۆ خەڵك دەبووری ئەوا منیش دەتبوورم﴾ خۆشەویستان خەڵك ببورن بەخشینی خوا بۆخۆتان بکڕن. ئەگەر یەکێك قەرزی لایەبیبوورن، چونکە خوای گەورە دەوڵەمەندی دەکات و ڕۆژێك هەقەکەت دەداتەوە. شەرمەزاری مەکەو مەیشکێنەوە چونکە ئەویش مرۆڤە، بەرامبەر ئەمەش ئەوانەی قەرزیان لایە، ئەگەر هەیانە با بیدەنەوە چونکە پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت: ﴿مطل الغني ظلم﴾ ئەوکەسەی پارەی هەیە، باقەرزەکەی بداتەوە، چونکە ئەگەر نەیداتەوە زوڵمە. ئێستا خەڵك هەموو پارەی کردۆتە قەرز، بەلام ئەگەر یەکێك نەیبوو بیبوورن خوا پێتانی ئەداتەوە.

خاڵێکی تر ئازیزان لەبەرچاوی منداڵ و خزم و کەس مەیان شـکێننەوە بەڵکو بەتەنهایی پێیان بڵێن بەبەرچاوی خەڵکەوە نەبێ.

خــاڵێکی تــری گــرنگ وریــای بــن لــەمانگی ڕەمــەزان یــەکتر مەشکێننەوە، لەکاتی بانگدا دوعای کرد هـەردوو قاچـی بڕایـەوە خـوای گەورە دوعایەکەی قبووڵ کرد. ئاگاداری ئەو کاتانە بن دوعای تیا قبـووڵ ئەبێ. ئەی ئەو کەسەی زوڵم ئەکەی خراپە، ئەگەر دوعات لێ بکرێ تەخت ئەبیت. جا زوو ئاشت بەوە لەگەڵ پەروەردگارت تۆبە بکە. خاڵی تر بـزانن (ان الله یمهل ولا یهمل) خوای گەورە فرسەتت ئەدات، بەڵام بتگرێ بـەرت نادات، تا چیرۆکی تر بە خواتان ئەسپێرم.

السلام علیکم ورحمة الله وبرکاته

چیرۆکی ١٤

# دونیا دەوران دەورانە

بسم الله الرحمن الرحيم

الحمد لله رب العالمين. الصلاه والسلام على حبيبنا محمد (ﷺ)وعلى اله وصحبه اجمعين. السلام عليكم ورحمه الله وبركاته.

ئازیزانم زۆرجار مرۆڤ لوتفی لەگەڵ دەکرێت پەروەردگار نازو نیعمەتی پێ ئەبەخشێت بەلاّم بەندە مەغرور ئەبێ نازانێ ڕۆژان ڕۆژی لەدوایە. بەڕاستی دەبێت بزانین هەموو حاڵەتێك گۆڕانی بەسەر دێت(كل حال يزول)هەموو حاڵێك دەگۆڕێت، هەموو ڕۆژێك شەوی لەدوایە. دەبێت مرۆڤ ئەم یاسایەی لەبەر چاو بێتو نابێ مەغروربێت، چونكە نازانێت دواڕۆژ خوای گەورە چی بەسەر دێنێت؟

فەرموون لەگەڵمان بن بۆ چیرۆکی ئەم جارەمان...

دوو برا لە ماڵێك دەژین باوکیان ئەمرێت برا بچووکەکە بەتەکەبورو خۆ بەگەورە زان بوو. برا گەورەکە ڕێك و بەرێز کاردەکات برا گەورەکە دەبێتە فەرمانبەر و برا بچووکەکەش ئیشی ئازاد دەکات و ڕۆژ بە ڕۆژ بەرەو گەنجی دەچن، برا بچووکەکە دەوڵەمەند ئەبێ، ئەوی تریان وەکو خۆیەتی ژن ئەهێنن و خێزان دروست ئەکەن و منالّیان ئەبێت. کوڕێکی برا گەورەکە بۆمان ئەگێڕێتەوە ئەڵێ: مامم مەغرور ببوو. کەمیوانی ئەهات ڕێزی باوکمی نەئەگرت، زۆر بەسووکی سەیری باوکمی ئەکردو وەك ئەوەی کە خزمەت کارێکە.

ڕۆژێکیان میوانمان هەبوو، باوکم وەك ئەوەی برا گەورەیە داوەتی کردو ڕۆژی دووەم هەموومان چوینە ماڵی مامم، بەلاّم مامم زۆر بەسووکی سەیری باوکمی ئەکرد وەکو خزمەت کاری ماڵ. زۆر خەمم خوارد باوکیشم ئەی وت: برا بچووکمە، کەم ئەقڵە، ئارام بگرن هیچ باسی لە خراپی ئەو نەدەکرد لای ئێمە ئەی دەشکاندەوە. گەنج بووین هەموو خوشك و براکانم کۆکردەوەو چووینە ماڵی مامم. چووین وامزانی مامم دەرگامان لیّ ئەکاتەوەو مامۆژنم پێشوازیمان لیّ ئەکات، بەلاّم مامم کە دەرگای کردەوە تەماشای کردین وتی: ئەوە لە کیّ ئەگەڕێن؟ جارێکیان بۆ ماڵیان چووم، وتی: بەڕەڵلاّ بەم بەیانییە وا لە دەرگا ئەدەیت، تفێکی لەناو چاوم کرد.منیش زۆر شکامەوە، لەم ڕۆژەوە (٣٠) ساڵی بەسەر چوو نەڕۆیشتمە ماڵی مامم، کە چوومە ماڵ بەباوکم وت ، ئەمیش زۆری پیّ

ناخۆشبوو. هەموومان بڕیارماندا لەگەڵ دایکم وتمان ناچینەوە ماڵی مامم تا سی ساڵ نەمانزانی کە ئێمە مامان هەیە یان نا.

من خوێندنم تەواو کرد، بووم بە ئەندازیار، دوایی بووم بە سەرۆکی یەکێ لە کۆمپانیا ئەهلیەکان. حاڵم زۆر خۆشبوو، بەهەزاران کرێکار لە ژێر دەستم کاریان ئەکرد، هەزار واسیتەیان ئەکرد تا من لای خۆم کاریان پێ بکەم، ڕۆژێکیان لە نوسینگەکەی خۆم دانیشتبووم پیاوێکی پیر هاتە ژوورەوە، بینیم مامە زۆر کزو لاواز بوو وتم:

کوا ئەو شەوق و زەوقەی جاران هەیبوو! منیش هەڵسامەوە دەستم ماچ کرد، لە بیرمدا ئەو خراپەی لەگەڵ باوکمی کردبوو و ئەو تفەی لە منی کرد بوو دەسووڕایەوە، بەڵام خۆم گرت چونکە باوکم ئێمەی فێرکردبوو، هەرگیز لەگەڵ خزم و کەسە نزیکەکان قسەی ناشیرین نەکەین وتم: مامە گیان چیت ئەوێ؟ وتی: کوڕم دەستم زۆر کورتە ئەگەر بە فەرمانبەر یا کارگوزارێك لای خۆت دام بمەزرێنی، منیش دەستم کردە گریان خەمێکی زۆر دایگرتم، مامم ئەو بازرگانە گەورە، ئەم هەموو پارەیەی هەبوو چۆن وای لێ هات! ئەو تفە بوو وای لە ئێمە کرد پەیوەندیان نەمێنێ، دەستم لە ملی مامم کردو وتم:

مامە تۆ لێرە لای من فەرمانبەری لە ژوورەکەم و کارەکەم بۆی تەواو کرد، چوومەوە ماڵی باوکم چونکە ئەو کات من ژنم هێنابوو ماڵم جیا بوو، باوکم سەری سوڕما! وتی:

تۆ هەرگیز بەم کاتە نایبێیت! وتم: باوکە شتێکی سەیر ئەمڕۆ ڕوویداوە، مامم هاتووە بە حاڵێکی ناوام دیوە، باوکم زۆر گریاو خەمی خوارد، منیش لە تاو باوکم دەستم بە گریان کردو وتی:

ڕۆڵە گیان مامت چواتر ساڵێکە ئاوای لێ هاتووە، من هەموو ساڵێك زەکاتی ئێوەم بۆ بردووە، نەم هێشتووە ئێوە بزانن، بەڵام ڕۆڵە گیان یەك ئامۆژگاریت ئەکەم، توخوا زۆر ئاگاتان لە مامتان بێت. ئازیزان با پەند وەرگرین:-

یەکەم: مەغرور مەبن ڕۆژان ڕۆژی لە دوایە، مەغروری لە دڵ و دەروونتان فڕێ بدەن.

دووەم: نەکەن تف لە برازاو خزمەکانتان بکەن چونکە کینە لە دڵیان ئەگرن، ئەگەر هەبوونیت ئەوا خزمەکانت لە دەوروبەرت کۆبکەوە، بە خزمەکانتەوە پیاوی، بێگانە تالێت ئەخوات خزمە، بەڵام کە کۆتایی هات ناتناسێت، بەڵام خزمی خۆت بە کەلکت دێت، بیربکەنەوە گەر خوای گەورە لوتفی لەگەڵ کردن، یەکەم جار با خزمەکانتان خێرتان لێ ببینن(الا **یقربون او بمعروف**) خزمەکانتان لە هەموو کەس لە پێشترن و نزیکترن خێرتان لێ ببینن.

سێیەم: براکان ئەبێ ڕێزێکی زۆری یەکتر بگرن، بە تایبەتی برا بچووك خزمەتکاری برای گەورەی بێت، ماڵی برای بچووك هەمووی ماڵی برا گەورەیە، ئێمە کەوتووینە زەمانێك لەگەڵ براکانمان تەمەنای

شکستیان لێ ئەکەین، خۆشەویستان برایەتی بەم جۆرە نییە، ئێمە براکانمان بە قوربانی هاورێکانمان ئەکەین.

مامەڵەی برا و برا مام و برازا، زۆر پێچەوانەی یەکتر دەبێتەوە، بزانە ئەم برازایە چەند کینی هەڵگرت لە مامی، چونکە هەڵس و کەوتی خراپی لەگەڵ باوکی دەکرد، سیفەتی باوکی باش ئەوەیە کەبرای خۆی ناشکێنیتەوە، لە بەردەم ژنوماڵەکەی، نەکەی کەسو کارت بشکێنیتەوە لە بەردەم منداڵەکانت چونکە ئەوانیش جورئەت پەیدا دەکەن، ئەمە تفی سەربەرەو هەورازە و بە ڕووی خۆی ئەکەوێتەوە.

چوارەم: بەڕاستی پەروەردەی جوان ناوایە و بەسەر وەسوەسەی شەیتانەوەیە.

تا چیرۆکی تر بە خواتان ئەسپێرم

السلام عليكم ورحمة الله وبركاته

## ١٥

# سوژده بۆ غەیری خودا!

بسم الله الرحمن الرحيم

ئازیزان... سیفەتی خۆشەویستی دونیاو خۆشیەکەی، ئاگایی لەو کەسە دەبڕێت، کە ئەچێتە دڵیەوە نازانێ کە مردن چاوەڕوانیەتی بەرەو مردن و گۆڕ دەڕوات، بێ ئاگایە لە کاری خۆی لە ژیانی خۆی، کاتێك فریشتەی گیان کێشان دێت، وا لەسەر گوناهە پەنابە خوا تووشی گوناه وبێ ئەمری خوا بووە، کاتێ ئەمرێ لەسەر گوناه بەڕوو ڕەشی ئەمرێ، خۆشەویستان ئەبێ ئاگاداری خۆمان بین، ئەوەك هەر کاتێك فریشتەی گیان کێشان بێت.

با پەند وەرگرین لەم چیرۆکە...

دوو هاوڕێ سەفەری وڵاتان ئەکەن بۆ بازرگانی، ڕۆژێکیان لە ناکاو تەلەفۆنێ ئەکرێ ئەڵێن: ماڵی فلانە؟ بەڵێ: ئەڵێت خێرا وەرن بۆ فڕۆکەخانە و تەرمی باوکتان وەرگرنەوە، کچێکی گەنجی ئەم پیاوە

ئەگێڕێتەوە، ئەڵێ:

خەریك بوو لە داخا شێت بین، چۆن بـاوکم وای بەسـەر هـاتووە! ئـەو چۆتە(بانکۆك) چەند ڕۆژێکە ڕۆیشتووەو ئێستا تەرمەکەی هاتۆتەوە، ئێمە زۆر خۆشگوزەران و دەوڵەمەند بووین، تەرمەکەمان هێنایـەوەو پرسـەمان گێڕا.

ئەو هاوڕێیەی لەگەڵ باوکم هام و شۆی ئەکرد، کەپێکەوە زۆر خـراپ بوون، ئارەقیان دەخواردەوە، کاری خراپیان زۆر دەکرد، بینیم دوای مردنی باوکم هەر پێنج نوێژەکەی لە مزگەوت ئەکردو تۆبەی کردووە، هیچ کاری خراپ نەما بوو کە لەگەڵ باوکم نەیکەن، وتم:

ئەبێ حیکمەت و نهێنییەك لەم کارەدا هەبێ!! چوومە سەر ڕێگـای، چونکە ماڵیان زۆر لە ئێمە دوور نەبوو و دراوسێ بووین، وتم: مامە گیـان وتی: بەڵێ، وتم: ئەوە چۆنە تۆبەت کردووەو گەڕایتەوە، هۆکار چی یە؟؟

چونکە ئێوە لەگـەڵ بـاوکم هـەموو کـارێکی خراپتـان ئـەکرد، کـە ئەچوونە دەرەوە چی خوا پێ ی ناخۆشە، ئەوتان ئەکرد، توخوا پـێم بڵـێ؟ وتی: ڕۆڵە گیان باوکت بووە هۆی ئەوەی خوای گەورە من هیدایەت بدات، وتم: باوکی من بووە بە هۆکار؟! بەڵێ نوێژێکی نەئەکرد و چی کاری خراپە نەیکرد! ووتی: ڕۆڵە گیان باوکت فێری دەرسێکی کردووم کە تاکو ماوم لە بیری نەکەم، وتم: مامە گیان فێری منیـشی بکـە وتـی: پێـشەمان وابـوو لەگەڵ باوکت ئەچووینە دەرەوە دوای ئەوەی شتمان ئـەکڕی و بـۆ خۆمـان

رامانئـەبوارد هـەر دووکمـان لـە (بـانکۆك) دوو ئـافرەتی زۆر جوانمـان هەڵبژارد، دوو ژوورمان هەبوو لە تەنیشت یەك بوو، دوای ئەوەی زۆرمـان خواردەوە، من ئەم وت: هی من جوانترە، ئەویش ئەی وت: نا ئافرەتەکەی من جوانترە، گرەومان کرد لەسەر هەزار دۆلار هی من هات زۆر جوانبـوو وتی: هیچ نی یە ئێستا هی منـیش دێـت گرەوەکـە دەبەمـەوە، درەنـگ کەوتو ئەم نەهات، هەڵستا دەستی کردە هام و شـۆ زۆر پەشـێو بـوو وتم: چیتە؟ ووتی: ئەترسم ئەم شەو نەیەت و دڵـم زۆر تەنگـە، ئەگـەر نەیـەت ئەمرم، شێت ئەبم.. هەر تەلەفۆنی بۆ لێدەدا وەرنە ئـەگیرا لـە ناکـاو لـە دەرگادرا ئەو ئافرەتەی باوکت چاوەڕێی بوو هاتە ژوورەوە، باوکت خۆی بۆ نەگیرا و سوژدەی بۆ برد هەر هەڵنەسایەوەو بانگمان کـرد وەلامـی نـەبوو گیانی دەرچوو بوو، خوای گەورە لە سوژدەدا ئەمانەتەکەی لێ وەرگرتەوەو ژیانی کۆتایی هات.

خۆشەویستان وریابن سـوژدە تـەنیا بـۆ خودایـە، لـە پێنـاو خـوای بالادەست نەبێ نەمرن، لە پێناو کاری چـاك نـەبێ نـەمرن، لـە مەیخانـە نەمرن لە شوێنەکانی تورەیی پەروەردگاری لێ یـە نـەمرن، هـەموو کـات ئاگاداری ئەوە بن فریشتەی گیان کێشان ئێستا گیانی بکێشێ و خەریکی کاری خراپە بێ، سەیر بکەن بێ ئاگایی و غەفڵەت چی لەم پیاوە کردو پێ ی کافر بوو، بەکافری مرد و بۆ هەمیشە لـە ئـاگری دۆزەخ دەمێنێتـەوە، خۆشەویستان با پەند وەربگرین.

یەکەم: ئەوانەی ئەچنە دەرەوە بۆ بازرگانی، تکایە لەگەڵ هاوڕێ ی باش برۆن، چونکە ئەو شوێنانەی بازرگانی تێدادەکرێت، بێ ڕەوشتی زۆری تێدا ئەکرێت، لە دوبەی لە دەرگات ئەدەن، وریابن بازرگانەکان(الركب الشيطان ، والراكبان شيطانان، الثلاث الركب) ئەوەی بە تەنها سەفەر بکات شەیتانە ئەگەر دووان بن ئەوا دوو شەیتانن، بەلاّم سێ کەس بن شەیتان ناتوانێ لەگەڵیان بێت، ئەمە پێغەمبەر(ﷺ) خۆی فەرموویەتی قسەی ئەوە، ئەگەر سێ کەس نەبن سەفەر مەکەن، ئەگەر لە بەر ترسی خوایش نەبێ، لە شەرمی یەکتر گوناه ناکەن، بەیەکەوە بن لەیەك ژوور و هام و شۆتان لەگەڵ یەکتر بێت، با شەیتان لێتان دوور بێت، هەر چەند بازرگانەکان پاك بن لای خوای گەورە گەورەن.

دووەم: غەفڵەت نەتانگرێ و ئاگاداری خۆتان بن وەك ئەم پیاوەتان لێ دێت غافڵ ئەبن لە غەفڵەتدا بە خزمەتی پەروەردگار دەگەن.

سێیەم: زۆر ئاگاداری ئافرەتان بن(اتقوا الدنيا اتقوا النساء)وریابن لە چاوی خۆتان ئافرەتی ئەم زەمانەیە دڵی پیاوان بۆ خۆیان ڕائەکێشن، بەم جل و بەرگ و خۆڕازاندنانەوە، پیاوان دەخەڵەتێنن وریابن لە ئافرەتان شەرەف و کەرامەتتان نەبەن، چونکە ئێوەش خوشك و کچ و دایکتان هەیە، لە دەرگای کەس مەدەن، با کەس لە دەرگاتان نەدات.

**تا چیرۆکی تر بە خواتان ئەسپێرم**

**السلام عليكم ورحمة الله وبركاته**




# چارەنووس

بسم الله الرحمن الرحيم

خۆشەویستان.......

میللەتی عێراق (٨) ساڵان سك سووتان و ماڵ وێرانی و دەربەدەری و شەڕی عێراق و ئێرانی چەشتووە، ڕووداوە دڵ تەزێنەکان زۆرن. ڕووداوێکم بۆتان ئامادە کردووە لەم هەموو ڕووداوە، ئەوەی کە بۆتانی ئەگێڕمەوە چیرۆکێکی ڕاستەقینەیەو پیاوێك ڕوو بەڕوو بۆمی گێڕاوەتەوەو هاوڕێمە. وتی : ئێمە لە (بەصرە)سەرباز بووین، وتیان: ئێوە گواستراونەتەوە، بۆ کوێ؟ کەس نازانێت بەڵام لە ناو شەڕێکە لە یەك ساتدا (١٠) تەرم دێتەوە.ئێران ئەیەوێ بەهەر چۆنێ بێ داگیری بکات، چونکە بڕوای وایە داگیری بکات ئەوا دەست بەسەر هەموو کەنداوی عەرەبی دادەگرێت، ئەو ناوچە بازرگانییە، وتی: سواری زیلیان کردین و ئێمە (١٠٠) کەس بووین.

(زابتێك) و چەندین (نائب زابتمان) لەگەڵ بوو هەر ئەڕۆیشتین. کاتژمێر ٢ ی شەو گەیشتینە ناو فاو، ئەوێش هەمووی چاڵەو تۆپ بارانیشە. ئەفسەرێك هات، وتی: کێ ئێوەی ناردووە؟ ئەو ئەفسەرە ی لەگەڵ ئێمە بوو کتابەکەی دەرهێناو وتی: فەرموو. ئەویش وتی: زۆر باشە پێنج پێنج دابەش بووین بەسەر ئەم چاڵانەدا ماندوون و بڕۆن بخەون تاکو بەیانی.

ئێمەش دڵخۆش بووین من و کوردێك لەگەڵ و (٣) عەرەب کەوتینە نێو چاڵێك کە (٣) عەرەبی تیابوو. بووین بە (٨) کەس، قەدەری خوای گەورە بەیانی لەگەڵ (الله اکبر)ی ئێرانیەکان خەبەرم بوویەوە. بینیمان (٣) کەسەکەی تر نەماون، و ئێمە هەر پێنج کەسەکەی ترین. ئەوان بۆ ئەوەی حاڵی (١٠٠) سەربازەکەی تر تێك نەدەن، چونکە ئەفسەرەکە کە لەگەڵ ئێران رێکەوتبوو بە خیانەت فاوی دا بە ئێران و ئێمەیان خەبەر نەکردبووەوە، خەریك بوو شێت دەبووین. (٣) سەربازەکەی تر بە نهێنی ڕۆیشتوون، ئێمە دراوین بە ئێران، کەمێك سەرم دەرهێنا، دیم هەمووی ئێرانیەکانن وادەگەڕێن ئەوەی کوشتوویانن و ئەوەی گرتوویانن، ئێمەش زۆر ماندوو بووین کەوتبووینە خەو ، نەمانزانیبوو چی ڕوویداوە. هەر ئاگام لە شوێنی خۆمەو نازانم ئەوانی تر چییان بەسەر هاتووە، ئێرانیەکان سەیری سەربازەکانیان ئەکرد ئەگەر زیندوو بوونایە دەیان کوشتن. ئێمە خۆمان بێدەنگ کرد تا شەو داهات، بە ئەوانەی لەگەڵ خۆم وت: وەرن خۆمان دەرباز بکەین، ئێمە دەفەوتێین، بابڕۆین کوردەکەی

لەگەڵم بوو وتی:

خەوم دیوە من ئەکوژرێم وتم: کاتی خەونی یە! شەیتان گاڵتەی پێ کردووی، (٣) عەرەبەکەش زۆر ئەترسان و دەگریان ئەیان وت: جێمان مەهێڵن، نەماندەزانی بۆ کوێ بڕۆین؟ ڕۆژهەلات و ڕۆژئاوا کوێ یە؟ ئێرانیەکان گوللەی روناك کردنەوەی زەوییان لێ دەدا زۆر ترساین ئەمان ووت:

گەر بە جلی عێراقی بمانبینن دەکوژرێین وتم: گەر (انفلاق جوی) یان لێ دا، سەری خۆتان نزم بکەن، گەر لێیان نەدا هێدی هێدی ئەڕۆین، ئەوەم لە بیر بوو، کاتێ ئێمە دابەزین لەم ناراستەیە بوو، زانیم کە ڕێگەی بەصرەیە ڕۆیشتین، کە (انفلاق جوی) یان لێ دەدا سەرمان نزم دەکرد، جارێکیان کە سەری خۆمم نزم دەکرد سەربازێ دەنگی هات بینیم ئەفسەرەکەی خۆمانە وتم: سەیدی ووتی: مەلێ سەیدی وتم: چی بکەم وا ڕاهاتووم، وتم: ئێمە (٥) کەس ماوین وتی: بێ دەنگ بە لاسلکی پێ بوو قسەی ئەکرد ئەی لێمان شێواوە، من ڕێگە دەزانم، ئەی وت:

بێ دەنگ بەو قسە مەکە، ئینجا دوو تەقە تەنوور لێ ئەدرێت لەنێوانیان دەبینین، تەرمێکی زۆر کەوتبوون، ئێمە هێدی هێدی لەسەر سك ئەڕۆیشتین هەموو لەشمان برینداربوو، قاچمان تاسەر ئێسك خوێنی لێ ئەهات و هەر چۆنێك بێت گەیشتینە خەلفی و جەماعەتی خۆمان بەیانیەکی زوو بوو کە گەیشتین ئەمجار بانگی بەیانی بوو، ئینجا هەرچی

برینداور نەخۆش حاڵیان خراپ بوایـە، سـواری زیلیـان دەکـرد دەیـانزانی خیانەت کراوەو فاو دراوەتە دەست ئێرانیـەکان و کـوژراوو برینـداری زۆرو سوپاش هەڵاتوون، منیش ویستم بچمە ناو زیلی پێی وتم: ئەبێ بـە پێیـان برۆین.

ئێمە (٥)کەس بە شەقامەکەدا رۆیشتین، ئەم لاو ئەولامان هەمووی دەبابە و چەك و شتی تـری جـەنگ بـوو، رۆیـشتین، ئەوکاتـە هـەواڵگری (مخابرات) سەربازی هەڵاتوویان دەکوشت، لە رێگا ئوتـومبێلی لـەنکرۆزەر هاتن زۆر یان قوروو خۆڵ لێدابوو وتیان: (انتم جباء انـتم هـاربون) وتمـان نەوەڵلا خیانەتیان لە ئێمە کرد، ئێمە تووش بووین ئاگامان لە هـیچ نییـە دەمانچەیان دەرهێنـا و گوللەیـەکی لـە نەوچـەوانی کوردەکـەدا، راسـت قسەکەیم بیر کەوتەوە کە وتی: خەوم دیـوە کـە بەربوویـەوە منـیش خـۆم خستە سەر زەوی، لەوەی تریشیان داو ئەمیشیان کوشت و منیش وتم: بـۆ نەچمە ژێر سەیارەکە خۆ بەربوومەوە، لە هی سێهەمیشیان داو ئەمیشیان کوشـت، منـیش خـۆم خـستە ئـەو دیـوی ئۆتۆمبێلەکـە و لـە هـی چوارەمیشیاندا سەیریان دەکـردن و دوایـی چـوونەوە نـاو ئۆتۆمبێلەکەو رۆیشتن هەر چوار تەرمەکەشیان جێ هێـشت و لـەوێ سـەنگەر (موضـع) هەبوو خۆم هەڵدا ناوی و دوو سەربازی تیابوو وتیان:(شـبیك ابـو تحریـر) واتە: چیتە؟، منیش ئەوەندە ترسابووم زمانم گیرا بـوو، ئەوەنـدە قـسەیان کرد نەم توانی وەڵامیان بدەمەوە، وتیان:

ئەمە ئێرانییە، دیلێکمان گرت، وایەری تەلەفۆنیان هێناو دەستمیان بەست هەر چی ئەمکرد نەمتوانی یەك قسەیش بکەم، ئەوانیش ئەیان وت:

ئێرانیەکمان بە دیل گرت، سەیر کەن چۆن جلی ئێمەی لەبەر کردووە، شەقیان لێ ئەدام و فرمێسکم ئەهاتە خوارێ منیان بردە لای ئەفسەرێك وتیان: سەیدی ئەوە ئێرانییە، لەملاتر ئەفسەرێکی گەنج سێ ئەجمەی هەبوو وتی: ئەوە ئێرانی نییە، تازە لێرە بوو، ڕاست زمانم بوویەوەو وتم: سەیدی ڕاست ئەکەیت، وتیان: ئەی بۆ دەمێکە لێت ئەدەین نەت وت؟ وتم:

فرسەتتان نەدام قسە بکەم ئەفسەرەکە وتی: لێ ی گەڕێن، منی بردە لای خۆی و وتی: من تۆم دیوە لەگەڵ ئەو کۆمەڵە کە خۆت بەردایەوە، خوا تۆی ڕزگار کرد، ئەگینا کوژرا بوویت، هەندێ ئاوی پێدام، لەگەڵ دەستێ جلی تازەو ئوتومبێلێکی ڕاگرت و وتی: بڕۆ جارێکی تر لەسەربازی نەتبینمەوە، لەم ڕۆژەوە هەڵاتم و ئەڕۆیشتمەوە سەربازی.

جا ئازیزان با پەند وەرگرین:-

یەکەم: ئەمەن بە دەست پەروەردگارە بە (ضیاء الحق)یان وت: ئەمریکا ئەتکوژێت وتی: (ان قرار موتي في السماء لا في الارض) بڕیاری مردن لە ئاسمانەوە دەرئەچێت، نەلە زەوی، خۆشەویستان لە مردن مەترسن، لە دوای مردن بترسن، باوەڕتان هەبێت مردن بە دەستی خوای

گەورەیە، تاکو مردن نەیەت نامریت، تا خوای بالاّ دەست بڕیار نەدات نامریت.

دووەم: لە حاڵەتێکا بمریت کە خوای گەورە لێت ڕازی بێت، نەك لە حاڵەتێکا کە پێ ی ناخۆش بێت.

تا چیرۆکی تر خواتان لەگەڵ

**السلام علیکم ورحمة الله وبرکاته**

چیرۆکی ١٧

# پاساو بدۆزەوە

بسم الله الرحمن الرحیم

خۆشەویستان ، ئازیزان.......

سەلام و میهرەبانی خوای میهرەبان برژێت بەسەر دڵ و دەروونمان، یارەبی بەناوە جوانەکانت بەسیفەتە بەرزەکانت دەست بەرز ئەکەینەوە ئەڵێین: یا رحمن یا رحیم یا غفور یا کریم یا حي یا قیوم یا بدیع السموات والارض ویاالله یا مالك الملك یا ذو الجلال والاکرام لێمان خۆش بیت. ئەگەر لێمان خۆش بیت هیچ لە مولکت کەم ناکات و هیچیش زیاد ناکات ،گەورەیی هەر بۆ تۆیە، دەخوایە گیان لێمان خۆش بە، یارەبی دڵمان بە نووری خۆت ڕووناك بکەیتەوە، خوایە دڵی ئارامان پێ ببەخشە، ئەو دلانەی تەنها تۆیان ئەوێت بە خۆشەویستی تۆو بە تۆ

شادن، ئەو دلانەی بە یادی تۆ ئاوەدانن، پەروەردگار بۆ خاتری ناوی بەرزت، بمانکەیتە سەربازی نەناسراوی ئەم ئاینە، خوایە گیان ئایینەکەت جوان بکەیت، وامان لێ بکەیت ئایینەکەت بەرزکەینەوە، بەوەفا بین بۆ تۆو پێغەمبەرەکەت (ﷺ)و ئایینەکەت و قورئانی پیرۆز یا أکرم الاکرمین.

خۆشەویستان ئێمەی موسڵمان هەندێ جار یەکێکمان خۆش ئەوێ، لە کاتی ئەم خۆشەویستییەو تەبایی یە سەردانی یەکتر دروست ئەبێ بەلام لەوانەیە جارێکیان دڵی خۆش نەبێ یا ڕووی خۆش نەبێت، ڕاستەوخۆ لەبەر دڵمان ئەکەوێ، هیچ پاساوێکی بۆ نییەو هیچ چاکەیەکی لەبەر چاو ناگرین. ئەم سیفەتە لەناو ئێمەدا هەیە، ئازیزان با چیرۆکێکی ڕاستەقینەتان بۆ بگێڕمەوە.

پیاوێك ئەڵێت: ئێمە سەرباز بووین لە سنجار، یەکێکمان لەگەڵ بوو، بەغدایی بوو، زۆر ڕێك بوو، یەکترمان زۆر خۆشدەویست، لە سەربازیش هەموو ئەوانەی وەکو یەکن یەکتر ئەگرنەوەو ئەوانەی ئاینیان هەیە بەیەکەوە، گاڵتەجارەکان بەیەکەوە وخۆشنووسەکان بەیەکەوە.....

پێغەمبەر (ﷺ) ئەفەرمووێت: (الارواح جنود مجندة) .

زۆر خۆشم دەویست پێنج شەممەو هەینی ئەمنەهێشت بڕواتە بەغدا بۆ ماڵەوە، دەمبردە ماڵی خۆمان و خزمەتم دەکرد و دوایی بەیەکەوە دەچووینەوە سنجار، دوای ماوەیەك گواسترایەوە بۆ بەغدا. وتم زۆر خزمەتم کردووە، بردوومەتەوە ماڵی خۆمان تۆ بڵێی ئەو خزمەتم نەکات؟

یەکەم پێنج شەممە گوتم: نارۆمەوە ماڵ ئەچمە ماڵی هاورێکەم ناونیشانی ماڵی خۆیانی پێدابووم. ئەی وت: تۆ تەنها وەرە ماڵم پات بەسەر چاو.

ڕۆیشتمە ماڵیان لەدەرگام داو چاکی و چۆنیەکی گەرمم لەگەڵ کردوو ئەحواڵ پرسی زۆرم کرد، بەلاّم ئەو زۆر بەساردی وەلاّمی دەدایەوە، منیش دوای وەستانو هەواڵ پرسی وتم: ئەڕۆم . وتی: خوا ئاگادارت بێت. کە ڕۆیشتم لەو دوور کەوتمەوە، زۆر قسەم پێی وت. خائن و جارێکی تر سەلامت لێ نەکەم. شەممە هاتەوە دەوام، سەلامم لێی نەکرد تا دوای مانگێك قسەم هەر لەگەڵی نەئەکرد. ڕۆژێك بانگی کردم و پرسی تەنها بڵێ تا بزانم بۆ لێم تۆرای؟ منیش وتم : چۆن نەتۆرێم؟ من هێندە خزمەتم کردوویت، یارمەتیم داویت، ئاوا وەلاّمم ئەدەیتەوە تاتوانیم قسەم پێی وت. ئەمیش وتی: وا نییە ئارام بە کاکە گیان کاتێ هاتی هاوسەرەکەم نەخۆش بوو، بەخوا پێشوازیم لێ نەکردی و نەتمبردە ژوورەوە تا نەمتوانی خزمەتم نەکردی، بەلاّم بەخوا تەنها ژوورێکم هەبوو خێزانەکەم نەخۆش بوو منالی نەبوو. کە هاتی خەریك بوو لەشەرما بمرم و زۆر خەجاڵەتت بووم، چونکە تۆ زۆر منەتت بەسەرمەوە هەیە، زۆرت خزمەت کردووم، کە وای وت زۆر پێم ناخۆش بوو، زۆر داوای لێبوردنم کرد وتی: من داوای لێبوردن ئەکەم، ئەمە حاڵم بوو.

خۆشەویستان چەندین حاڵەتی وا هاتووەتە سەرمان کە ئەڕۆینە ماڵی یەکێك، تۆ لە حاڵی ئەوان نازانیت، کە بەر لەچوونت بۆ ئەویێ حاڵیان چۆن

بووە. گلەیی مەکە، پاساویان بۆ بێنەوە، ئەگەر خاوەن ماڵ بێتاقەت بوو زۆری مەدوێنە، ڕەچاوی حاڵیان بکە، ئەگەر توانیت هەندێ قسەی خۆشی بۆ بکە، ئەگەرنا جێی بێڵە. خوای گەورە ڕەوشتێکی زۆر جوانی فێر کردووین، ئەفەرموێت: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَدْخُلُوا بُيُوتًا غَيْرَ بُيُوتِكُمْ حَتَّى تَسْتَأْنِسُوا وَتُسَلِّمُوا عَلَى أَهْلِهَا ذَلِكُمْ خَيْرٌ لَكُمْ لَعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ﴾ ئەم ڕەوشتە﴿وَإِنْ قِيلَ لَكُمُ ارْجِعُوا فَارْجِعُوا هُوَ أَزْكَى لَكُمْ وَاللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ عَلِيمٌ﴾ ئەگەر چوون بۆ ماڵێك لەدەرگاتاندا وتیان بگەڕێنەوە ناتوانین لە خزمەتتان بین، بگەڕێنەوە. خۆشەویستانم هاوەڵی پێغەمبەر (ﷺ) هەیە، (٣) ساڵان لەهەوڵی جێ بەجێ کردنی ئەم ئایەتەم، ناتوانم لەبەر ئەوەی ئەڕۆمە هەر ماڵێ ئەمەوێت پێم بڵێ بگەڕێوە تا منیش بگەڕێمەوە، واناڵێن پێشوازیم لێ ئەکەن. پێغەمبەر (ﷺ) ئەفەرموێت: ﴿التمس لاخيك سبعين عذرا﴾ ئەفەرمووێ: (٧٠) پاساوی بۆ بێنەوە، ئەگەر چووی بۆ لای یەکێ پاساوی بۆ بێنەوە، بزانە ئەخۆشە کێشەی نییە. لەشەقام گەیشتیە هاورێکەت ڕووی لەگەڵت خۆش نەبوو، بزانە کێشەی زۆرە، زەرەری کردووە، خەمی هەیە. خۆشەویستان خەم ئەڵێی دڵۆپەی بارانە بەسەر هەمووان، کێ هەیە خەم و کێشەی نەبێت؟ لەگەڵ یەکتر دڵسۆزو دڵ ساف بن، خۆشەویستان ئاوا نابێ، ئەگەر ئێمە یەکترمان خۆش بوێت. بەهەر چۆنێ بێ، ئەبێ یەکتری قبووڵ بکەین، ئازیزان ئەم حاڵەتە لەناو ئێمە زۆرە لەیەکتر نابوورین، با ئاوا نەبین.

جارێکی تر بڕۆرە لایان و لە حاڵیان بپرسەو بزانە کە هەمووان کێشەو گرفتیان هەیە، گەر کەسێ ڕووی خۆش نەبوو لەگەڵتا، ئەگەر پێشوازی لێ نەکردیت گلەیی لێ مەکە.

هەمووان وەکو یەك وان و مرۆڤن. بەگەرما گەرمای ئەبێ، بە ساردی سەرمای ئەبێ. ئەبێ مرۆڤ مامەڵەی مرۆڤ لەگەڵ یەکتر بکا، هی وا هەیە تەنها خەمێکی هەبێت لە ڕووی دیارە. با ئێمە لە چاکەکان بین لەیەکتر ببورین. دونیا چی تیایە! من پێم سەیرە! ئەڵێ : من چەند جار چوومەتە ماڵیان، ئەوان نەهاتوون منیش ناچم. ئازیزان با دڵسۆزی یەکتری بین با لەگەڵ یەکتر بار سووك بین هاوڕێیەتی و خزمایەتیمان بارگرانی نەبێ، هاو خەم و هاودەردی یەکتر بین، جا بەڕێزان ئێوە چیرۆك و بەسەرهاتی زۆرتان لایە بۆ یەکتری باس بکەن و پەندی لێ وەربگرن. تا شەوی تر بە خواتان ئەسپێرم .

السلام علیکم ورحمة الله وبرکاته




# دڵی دایك

بسم الله الرحمن الرحیم

بەڕێزان...

ئـازیزانم سـەلام و میهرەبـانی پـەروەدگارمان بـڕژێ بەسـەر دڵ و دەروونمان، یارەبی بە ناوە جوانـەکانت بـە سـیفەتە بـەرزەکانت داوات لێ ئەکەم ئەڵێم: **یارحمن یاغفور یـاکریم یـاحی یـاقیوم یابـدیع الـسموات والارض ویاالله ویامالك یاذ الجلال والاکرام** یارەبی خوایـە گیـان لێمـان ببووری گەرمان بوری هیچ لە موڵکت کەم ناکـات، گەرنەیـشمان بووریـت هیچ لە دەسەڵاتمان نییە، گەورەیی هەر بۆ تۆیە دەی خوایـە گیـان لێمـان خۆشبیت دڵمان بە نووری خۆت ڕووناك بکەیتەوە خوایە گیان دڵی ئارامان پێ ببەخشە، ئەو دڵانەی بە یادی تۆ ئارام ئەگرن **امین یا اکرم الاکرمین.**

خۆشـەویستان ئێمە هەموومان خـوای گـەورە بـە شـەڕەفی کـردووین

دایك و باوكمان هەیە، جا هەیە هەردووكیانی هەیە هەیشە دایكی یان باوكی هەیە، وەیان هەردووكیانی مردوون، ئازیزان مرۆڤی ڕێك و ئیمانداری مولتەزم و خاوێن ئەوەیە، كە بەڕاستی خزمەتكاری دایك و باوكی بێت، چونكە بە ڕاستی دایك و باوك كەس شوێنی ناگرێتەوە كە ئەوان ڕۆیشتن ئیتر كەس نی یە دایك و باوكمان بێت، لە قورئانی پیرۆز هەمان داوای هەیە و واجبی كردووە لەسەرمان(**واخفض لهما جناح الذل من الرحمة وقل ربي ارحمهما كما ربياني صغيرا**)ئەبێت زۆر نەرم بین لەگەڵیان، زۆر كات كە ئێمە هاوسەر ئەگرین قسەو كرداری خێزانەكانمان لەسەر سەرمان دا ئەنێین و ڕێزیان ئەگرین، بەلاّم قسەی ئەوان نا، زۆرمان ئەو كێشانەمان هەیە، یان لای دایك ئەگرین و خێزانەكەمان بەر ئەدەین، یا بەپێچەوانەوە، ئەمەش دادپەروەرانە نییە، دادپەروەری ئەوەیە كە دڵی دایك و دڵی خێزانیش ڕابگرین، دایك مافی بەسەر تەوەیە، هەروەها خێزانیش مافی هەیە(**مل الحق ذي حق حقه**)پێغەمبەر(ﷺ) ئەفەرمووێ هەموو خاوەن مافەكان مافی خۆیان بدەن، نە دایكت زاڵ بكە بەسەر خێزانت، نە خێزانت زاڵ بكە بەسەر دایكت، ئەمەش بەژیری مرۆڤ ئەبێت.

چیرۆكی ئەمڕۆمان لەسەر دایك و كوڕێكە، ژنێك یەك كوڕی هەیە لە پاش پیاوەكەی و هەر گەنجیشە و زۆر منالّەكەی خۆشئەوێ لەتەمەنی(٦) باوكی مرد تاگەیشتە (١٨) ساڵی، ئەو دایكە ئیش ئەكات واتە نان ئەكات و جل ئەشوات و خزمەتكاری خەڵكی ئەكات، لەبەر ئەوەی تەنها

نانی حەڵاڵ پەیدا بکات، ماڵی باوکی دەستیان کورت بوو، نەی ئەتوانی لەگەڵیان بژی و خۆی خۆی بەخێو ئەکرد دوای ئەوەی کوڕەکە گەورە بوو زانکۆی تەواو کرد دایکی زۆر دڵخۆش بوو وتی:

ئێستا بەری دارەکەم ئەخۆم، ماندوو بوونی دەربکات و کوڕەکەی دابمەزرێت، ئافرەتێکی جوانیش بۆ کوڕەکەی بێنێت، لە خانوویەکی خۆش بژین، ئەوەندە تەمەنەی کە ماویەتی لە خۆشیا بژین، بەلاّم ئەمانەی هەموو خەیاڵ و ئەفسانە دەرچوو نەگەیشتە ئەوانە، چونکە کوڕەکەی دڵی کەوتە سەر کچێکی دەوڵەمەندکوڕەکە وتی:

دایکە ئەمەوێت هاوسەربگرم، دایکی وتی: هەموو ئاواتم ئەوەیە کە تۆ هاوسەربگریت کێت ئەوێ بۆتی بێنم؟ وتی: دایکە فلاّنە کچم ئەوێ لەزانکۆ یەکترمان ناسیوە، دایکی بیری کردەوە ئەم کچەی بۆ نێنێت، زۆری پێناخۆش بوو، کوڕەکە وتی: ئەگەر ئەتەوێ من خۆشی و شادی ببینم، لە ژیان دڵخۆشبم، ئەم کچەم بۆ خوازبێنی بکە، دایکەکە وتی:

چیت ئەوێت بۆتی ئەکەم زۆری هەوڵدا، وتی: ئەوان ناشێن بۆ ئێمە، بەلاّم کوڕەکە وتی: هەر ئەم کچەم ئەوێت دایکی چووە خوازبێنی ئەمانیش رازی بوون، بەلاّم مەرجمان هەیە وتی: چی یە؟ وتیان: ئەوەندە زێڕو پارەمان ئەوێت دایکەکە بە کوڕەکەی وت: ئێمە ئەم هەمووەمان نییە، کوڕەکە وتی:

من قەرزی ئەکەم، قەرزی کردو کچەی مارەبڕی، دوایی وتیان:

ئاهەنگی(دەست نیشانکردنی بۆ بگێڕێ) کوڕەکەش وتی: ئەمە لە ناو ئێمە دانی یە وتیان: دەبێت هەر بیکەی دوایی وتیان: بیگوازەوە وتی: باشە مەولوودێك ئەخوێنینەوە، ئەیگوازمەوە وتیان: نەخێر، ئەبێ بیبەیتە هۆڵ و ئاهەنگی بۆ بگێڕیت، ئەمەشی کردو بووك هاتە ماڵەوە، مانگێك باش بوو، دوای مانگەکە بووکەکە قسەو پرتە پرتی ئەکرد، دایکی وتی: کوڕم ئەوە چی ئەوێت؟ وتی: لێ ی گەڕێ وازی لێ بێنە، ڕۆژێك بوکەکە بە کوڕەکەی ووت: دایکت نابێت بێت لە دانیشتنی من دانیشێت کوڕەکەش وتی:

بۆچی؟ وتی: من شەرم ئەکەم دایکت کرمانجە و ئێمە شارستانین، کوڕەکەش بە دایکی وت، دایکی وتی: من هەر پەیوەندیم پێیەوە نییە بەخێر هاتنی میوانەکانی ناکەم، کوڕەکە وتی: لە چێشتخانە مێیە دەرەوە دایکی وتی: باشە وتی: دەبێت دایکت دەربکەیت لە ماڵەوە، کوڕەکە وتی: بۆ؟ وتی: من بێزم لە دایکت ئەبێتەوەو سەرو دڵم تێك ئەچێت وتی: ئافرەت لە خوابترسە وتی: یا من، یا دایکت هەڵبژێرە؟ کوڕەکەش ڕوحی لە ژێر پێ ی ئافرەتەکەیە وتی:

دایکە گیان چەند ڕۆژێ برۆ ماڵی خاڵەم، بەڵکو باشتر بێت، هەمرو ئاواتی دایکی ئەوە بوو ئەوان لە خۆشیدا بژین، ئیش و کاری ماڵیان بۆ دەکات، ئەم بێ ویژدانانە ڕازی نین، ئەچێتە ماڵی براکەی و دەبینێ حاڵی زۆر خراپە، ژنی براکەی قسەی پێ ئەڵێ، ئەمیش ئەڕوات براکەی وا

ئەزانیٚ کە چۆتە ماڵی خۆی، بەڵام خۆی بزر ئەکات دوای هەفتەیەك کوڕەکە دایکی نایەتەوە ئەچێتە ماڵی خاڵی ئەڵیٚ: دایکم نەهاتۆتەوە ئەوانیش ئەڵێن یەك شەو لامان مایەوەو ڕۆیشت، هەموو ماڵە خزمەکان دەکات لەویٚ نی یە، دوو هەفتەی پیٚ ئەچێت نایەتەوە هاوسەرەکەی دایکی لە بیر ئەباتەوە ئەڵیٚ: ئاخۆ لە ماڵی کێیەو سەفەری کردووە لیٚ ی گەڕیٚ، لە کۆڵمان بوویەوە ئەمانتوانی قسەیەکیش بکەین لە ماڵی خۆمانین و هیچیشی بەسەر نایەت.

کوڕەی ڕازی کردو دایکی بیرچوو، جار ناجار بیری ئەهاتەوە، بەڵام لەبەر سەڵتەنەتی ژنەکە، شەیتان بیری ئەبردەوە، سبحان الله دوای ساڵێك کوڕەکە نەخۆش بوو، دایکیشی هێشتا بزرە، کە نەخۆش بوو لەسەر جێگە کەوت، هێشتا قەرزی لەسەر مابوو، چەندین دکتۆری کرد، وتیان: دەردت دەوای نییە، چەند مانگ دوای ئەوە دایکی زانیبووی کە کوڕەکەی نەخۆشە و لە نەخۆشخانە کەوتووە، هەڵسا چوو بۆ لای بووکەکەی ئەیبینێت و بووکەکەی لەگەڵی ئەکاتە شەڕو دەنگە دەنگ، ئەڵیٚ: هەمووی لە پای تۆیە دوعاو ئاهی تۆیە، ئەم کوڕەت واڵیٚ کرد، بڕۆ ژیانی ئێمەت تێکدا ئەیهێشت دایکی کوڕەکەی ببینێت، کە یەك ساڵە ئەیدیوەو جیٚ ی هێشتووە.

دایکەکەش ڕۆیشت و بووکەکە چووە ژوورەوە، کوڕەکەش گویٚ ی لە دەنگە دەنگیان بوو، بەڵام ئەی وت: دایکم بێتە ژوورەوە دکتۆرەکان وتیان:

تۆ چارەسەرت نی یەلێرە، ئەگەر برۆیتەو ولاتانی دەرەوە، ئەگەر نا لە نەخۆشخانە برۆو، شوێنیش مەگرە، کورە چووە ماڵەوە ماوەیەکی باش لەسەر جێگە کەوت، حالی زۆر خراپ بوو، پارەی نەما ئەو پارەی هەڵیشی گرتبوو بیداتەوە قەرز ئەویشی نەما، هەندێ شتوومەکی مالی فرۆشت سوودی نەبوو، بەشی داودەرمانی نەکرد، لە کۆتایی ئافرەتەکە بیری کردەوە وتی: تاکەی بە دیار ئەم پیاوە نەخۆشە دانیشم، من هێشتا گەنجم بووکی ساڵێکم، بۆ داوای تەلاق نەکەم وتی: تەلاقم ئەوێت، ئەمیش وتی: لەسەر تەختی نەخۆشی جێم نەهێڵی، ئەی ئەم قسانەی بەیەکەوە نەمانکرد، ئافرەتەکەش وتی:

خۆ من بەختم وا رەش نەبووە، دانیشم بە دیارتەوە، ئافرەت ئەی ئەم هەموو بەڵێن و پەیمانە و قسە خۆشانەی نەمانکردن دایکم لەبەر تۆ رۆیشت و جێ ی هێشتم، خۆم تووشی تووڕەیی پەروەردگارکرد، تووشی لەعنەت و نەفرەتی پەروەردگار بووم، ئافرەتەکە وتی: یەك هەفتە ماوەت هەیە، ئەگەر چاك نەبیتەوە تەلاقم ئەوێت، دوای هەفتەیەك زۆر دوعای کرد هەر چاك نەبۆوە، ئافرەتەکەش زۆر داوای کردو ئەی وت: هەر تەلاقم ئەوێت، تەلاقی داو لەسەر تەختی نەخۆشی جێ ی هێشت بە تەنیا لە ماڵەوەیە و شەو هات و سەعاتێکی ماوە بۆ نوێژی بەیانی ئەو کاتە خوای بالادەست دێتە ئاسمانی یەکەم و بانگی بەندەکانی ئەکات ئەڵێ: کێ هەیە؟ دوعا بکات با قبوولی بکەم، کێ هەیە لێقەوماوە؟ بابە هانای

بچم، کێ گوناهی کردووە؟ بالیێ ی خۆشبم، کێ خەم و پەژارەی هەیە؟ با بۆی لابیەم، کێ هەیە داوا ئەکات؟ قبوولی بکەم، تا بانگی بەیانی ئەدات، خۆزگە ئێمە یەکێك بوینایە لەم کەسانەبڵێین خوایە من هەوم من خاوەن کێشەم و خاوەن پەژارەو خەمم من تاوانبارم.

لەم کاتە دا زۆر گریاو زۆر پاڕایەوە بەڵکو خوای گەورەشیفای بدات، بەڵێنی دا گەر چاك بێتەوە دایکی بدۆزێتەوە تا ئەمرێت تۆزی ژێر پای خاوێن بکاتەوە، خوای گەورەش دوعاکەی قبوولّ کردو خوای گەورە ڕاستی ئەوی بۆ دیار کەوت و زانی لە دڵەوە بەڕاستیەتی قبوولی کرد ئیتر تا دوای هەفتەیەك رۆژ بە ڕۆژ باشتر ئەبوو، ئەکەوتە سەر خۆی هەزار شوکرو سوپاس بۆ پەروەردگار چاك بوویەوە ئیتر بە دوای دایکی دەگەڕا، ١٠ ڕۆژی پێچوو تا دایکی دۆزیەوە، چ دیمەنێکە، هەندێ خانوو کراون کە تەنها هەیکەلە، دایکی لەم خانووە کەلاوەو نا تەواوە ئەژیت، ژوورێکی بۆ خۆی چاك کردووە و پەنجەرەکانی بە دارو نایلۆن چاك کردووە یەك بەرەی هەیە ئەبینێ دایکی لەوێ کەوتووە(٣) ژەم خواردن دراوسێکان بۆی دێنن، دایکێك ٢٥ساڵ بەمەردانە ژیا، ئێستا وا لە کونجی دیوار کەوتووە، دایکێك بەشەرەف ژیا بەلاّم کوڕی ئاوای بەسەر هێنا، کە چاویان بەیەکتر کەوت دەستیان کردە ملی یەکترو زۆرگریان، کوڕەکە دەست و پێ ی دایکی ماچ کرد، چونکە زانی تاوانێکی کردووە، دایکیشی گەردنی ئازاد کردو دایکی بردەوە ماڵی خۆیان وتی: دایکە تەنها گەردنم ئازا بکە تا

ئەمرم خزمەتت ئەکەم، تۆزی ژێر پێت ئەبم من هەڵە بووم ببورە.

خۆشەویستان با پەندوو ئامۆژگاری لەم چیرۆکە وەربگرین، چونکە مەبەستی ئێمە پەند وەرگرتنە(فاعتبروا یا أولی الابصر) ئەی ئەم بەندانەی ئەقڵیان هەیە پەند وەرگرن:-

یەکەم: ئەوەی کە خزمەتی دایك و باوکی نەکات سەرکەوتوو نابێ، گەنجان خوشکان برایان گەر ئەتانەوێت بەختەوەر بن ژیانێکی ئاسودەو کامەرانتان هەبێت، خزمەتی دایك و باوکتان بکەن، خۆ ئەگەر ئەتانەوێ بەر رەحمەتی خوای گەورە بکەون خزمەتیان بکەن، ئەگەر ئەتانەوێت ژیانیان خۆش بێتو سەرفرازبن، خزمەتیان بکەن خوای گەورەش لە یادتان ناکات و سەر بەرزو سەر فراز ئەبن.

دووەم: هەموو سزایەك لە رۆژی قیامەتە، تەنها سزای ئەزیەت دانی دایكو باوك لەدونیا دایە، وریابن (کما تدین تدان) بەخوا چۆن بیت لەگەڵ دایك وباوکت، منالەکانیش ئاوا ئەبن لەگەڵت. تۆ جارێك لەدەست ئەوان بلێی ئۆف... منالەکانت سەد جار پێت ئەلێن، لە ژوورەوە بکەون خزمەتیان نەکەی، منالەکانت وات لێ دەکەن و هەزار جار پێت ئەلێن: ئاه... لەدەستت، چیان پێ بلێی ، ئاوات پێ ئەلێنەوە، وریا بن نەکەن ئەزیەتیان بدەن. خزمەتی دایك و باوکتان بکەن.

سێ یەم : ئەم دایك و باوکە نیعمەتی خوای گەورەن، پلەو پایەت بە خزمەتی ئەوان بەرز ئەبێتەوە لە قیامەت، بزانە دایك و باوکت چۆن بوون

لەگەڵت، نەیان نەهێشت بگری و نەیان نەهێشت پێویستیت هەبێت، چەندە جوان بەخێویان ئەکردیت! ئەی تۆ بۆ ئەوان لەسەر شانت بوونەتە بارگرانی، وائەزانی ئەم هەبوونیەو دەوڵەمەندیە هی خۆتە؟! نا هی دایك و باوکتە، رزق و بەرەکەتی ئەوانە، هەر بەنزاو پاڕانەوەی ئەوانە تۆ پارێزراوی. وریا بن دایك و باوك زۆر هەستیارن، سەیرکەن ئەوان ئێمە بەخێو ئەکەن بۆ ژیانی ئێمە . ئێمە ئەوان بەخێو ئەکەین بۆ مردن!!! ئێمە ئەڵێین ئەوان بمرن و لەکوڵمان ببنەوە، ئەوان ئەڵێن ژیانت خۆشی بێ، نەخۆش بین شەو تا بەیانی بەدیارمانەوە ئەگرین و ئەڵێن نەمرن، ئێمەش ئەڵێین نامرن و لەکۆڵمان نابنەوە، وای لەم دوو دڵە چەند جیاوازن!!

چوارەم: ئازیزان ئەبێ پیاو پیاوبێت، هاوسەنگی نێوان دایك و باوکی رابگرێت لەگەڵ خێزانەکەی، ڕەنگە بپرسی چۆن؟!!

سەیرکەن دایکی لەچکەکەی گشتی دڕاوە، نابینێت لەچکی دایکی دڕاوە بەڵام مۆدێلی لەچکی خێزانەکەی ئەبینێ و مۆدێلێکی تری بۆ ئەکڕێت، لەبازاڕ شت ئەکرێت هەر لەبیری خێزانیەتی. بۆ دایکی شت ناکڕێت، بۆ دوان ناکڕیت، بۆ دایکیشت؟ ئەگەر ئاوا جوولایتەوە، بەختەوەر ئەبی ، ڕەنگە بلێی چۆن ئەبێ؟ بۆم دەرناهێنیێ؟ بۆ ناکرێت (٣) لەچك بکڕە بۆ دایکت و خێزانەکەت و خوشکت بۆ ئەوت لە بیر نییە هەر بۆ خێزانت شت ئەکڕیت،هەر لە بیری ئەو دایت، دایکت ئەڵێ ئەو بووکە کوڕەکەی منی زەوت کردووە، ئەتۆرێ و هەست بە زوڵم ئەکات، جا

بەرێزان پەندو ئامۆژگاری لەنزا هەیە....

پێنجەم: بــا دایکــان دڵ فــراوانتر بــن، لــە ئــەقڵ و بــیری کوڕەکــەی تێبگات. ئەگەر بووکەکەی شتێکی کرد با تێی بگات بــچووك ترە،ئاگــای لێ بێت چەندە باش بێت لەگەڵیان هەرکەمــە. ئــەبێت دڵ نــەرم بێــت لــە گەڵیان و ئەم بووکە گەنجە،چەندین ئاواتی لە دڵی خۆی داناوە، بابەئارامی لەگەڵیاندا بێت وەکو کچی خۆی سەیری بکات، وەك دایك بە بۆی،نــەوەك وەکو خزمەتکار سەیریان بکــەی، چــۆن لەگــەڵ کــچەکەت ئــەبیت،ئاواش لەگەڵ بووکەکەت بە، ئەم هەویرە ئاوی زۆری ئەوێت پیــاوی مەلەوانیــشی ئەوێت.

السلام عليكم ورحمة الله وبركاته

١٩

# سپڵە

بسم الله الرحمن الرحيم

ئازیزان چیرۆکی ئەم جارەمان باسی باوکە ئەمیش ڕەنجی کێشاوەو هەوڵی داوە. خوای گەورە ئەفەرموویت: ﴿وَقَضَى رَبُّكَ أَلاَّ تَعْبُدُواْ إِلاَّ إِيَّاهُ وَبِالْوَالِدَيْنِ إِحْسَانًا﴾ واتە: خودا بڕیاری داوە کە نابێت جگە لە (الله) کەسی تر بپەرستین پاڕانەوەو کڕنووش

بردن هەر بۆ ئەوە، داوا کردن هەر لەئەوە، کەسی تر مافی ئەوەی نییە داوای لێ بکەی، چونکە کەسی تر وەکو ئەو بێ کەم و کوڕی نییە. ئازیزان ئینجا دوای ئەوە ﴿وَبِالْوَالِدَيْنِ إِحْسَانًا﴾ چۆن خوای گەورە بڕیاری داوە کە تەنها پەرستن بۆ پەروەردگارە، ئاواش لەگەڵ دایك و باوك باش بن و نابێت لە خزمەت کردنیاندا جیاوازیان پێ بکەین، چونکە هەردووکیان مافیان بەسەرتەوە هەیە، هی دایك زیاترە بەڵام هی باوك کەمتر نییە، ئەبێ

خزمەتکارو گوێ ڕایەڵی هەردووکیان بین، لەگەڵم بن بۆ چیرۆکی ئەم جارە، بزانن خوای گەورە چۆن تۆڵەی کردەوە لە کوڕێك :-

کوڕێك ئەبێت لە زانکۆ ئەخوێنێ، حاڵێکی خۆش و باشی هەیە. ماڵەوەیان باشن‌و ٣ کچی تریان هەیە. کچەکان ئەڕۆنە ماڵ و حاڵی خۆیان، ئەم کوڕەیان بەنازو خۆشیەکەوە بەخێو کراوە، باوکی بیر ئەکاتەوە کوڕە کاتێ هاوسەرئەگرێ، ئەڵێ خانوویەکی گەورە ئەکڕم ماڵی کوڕەکەم لەسەرەوە خۆم لە خوارەوە، باخچەیەکی گەورە دروست ئەکەین و تامردن لای یەکتر ئەبین. کاتی خوازبێنی و داواکاریە وتی بابەگیان من کچێکم لە زانکۆ دەست نیشان کردووە، گەر بەختەوەری منتان ئەوێت ئەم کچەم خۆش ئەوێت و هەر ئەوم دەوێت، باوکیشی کچەی بۆ دێنێ و خانوویەك ئەکڕێت، خۆیان لە خوارەوەو کوڕو بووکەکەی لەسەرەوە ئەبن، دوای ساڵێ دایکی مردوو باوکیشی تاقەتی نەما، ئیش و مامەڵەی نەئەکرد و کەوتەماڵ کوڕەکە مەسرەفی ماڵی ئەکرد، بەڵام باوکی زۆر بێ خزمەت بوو، کوڕەکە فەرامۆشی کرد بوو، بزانە ئەم باوکە ئەم هەموو ناواتەی هەبوو، کوڕەکەی هەر چی پێویست بوو بۆی جێ بە جێ کردووە، بەڵام ئێستا لەسەر جێگە کەوتووە نایباتە لای دکتۆر، بە حاڵ و زۆر بەزەحمەت تا بردیە لای دکتۆرێك هێنایەوە ماڵ و لە ژووری فڕەیدا، هەر نەئەچووە لای بووکەکەش لەم خراپتر، چونکە سەیری کوڕەکەی ئەکرد، باوکیشی ڕۆژ بەڕۆژ حاڵی خراپتر ئەبوو، ئەت ئەتوانی بڕێتە ژوورەکەی لەبەر بۆنی

ناخۆش، تا ڕۆژێك ژنەکە بە کوڕەکەی وت:

بۆ باوکت فڕێ نادەیتە دەرەوە، ماڵەکەمان بۆنی ناخۆش بووە، بافڕێی بدەین، تا شەوێکی زستانو سەرما خەڵك لە ژوورەوەن، ئەم کوڕە زاڵمە هەڵدەستێ باوکی لە نێو بەتانییەك دادەنێو فڕێی ئەداتە دەرەوە شەو تا بەیانی بارانی لێ ئەدات و خوێن لە دەم و لووتی دێت، لەسەرما ڕەق ئەبێتەوەو دەمرێ، بەیانی خەڵك لە نوێژی بەیانی لەمزگەوت دێنە دەرەوە تەماشا ئەکەن بەتانییەك لە ژێر دارێك کەوتووە، شەختە و بەفر ڕەقی کردووە، سەیری ئەکەن پیاوێك لە ناویدا مردووە، هەواڵ دەدەنە پۆلیس ئەیبەن ئەیشارنەوە دوای لێ پریسنەوەو بە دواداچوون یەکێك لە ئەهلی مزگەوت وتی: من ئەیناسم دوو ساڵ بەر لە ئێستا ئەهاتە مزگەوت، بەلام ئێستا دیار نییە وتی: ئەیناسم و فلانە.

دوای هێنان و بردن دادگایی کردن کوڕەیان گرت و ، دەرکەوت، ئیسپات بوو، کە باوکی خزمەت نەکردووەو فڕێ داوەتە دەرەوە ٢٠ساڵانیان حوکم کرد، بووکەکەش دوو گیانەو منداڵی بوو، مووچەی مێردەکەی وەرئەگرت و کوڕەکەی پێ بەخێو ئەکردو کوڕی گەورە بوو ئەیبردە لای باوکی کە ئەڕۆیشتە زیندان ژنە بە کوڕەکەی ئەوت: لەبەر دەرگا چاوەڕێم بکە تا دێمەوە باوکیشی ئەی ووت: بۆ کوڕەکەم ناهێنی؟ ئەمیش ئەی ووت: با باوکی لە زیندان نەبینێت دوای ٢٠ساڵ زیندانی و چاوەڕوانی ئینجا وتی:

رۆڵە گیان ئەمرۆ باوکت لە زیندان دێتە دەرەوە، با برۆینە پێشوازی، کوڕەش خەریك بوو باڵ بگرێ لە خۆشییان کە ئەمرۆ باوکی ئەبینێ، باوکیشی لەبەر دەرگای زیندان چاوەڕێ دەکات کە بێن بە شوێنیدا، کەمێکی مابوو کوڕەکەی بگاتە لای باوکی، دایکی ووتی: رۆڵە، ئازیزم ئەوەی لەم سەرەدا وەستاوە، باوکتە سەیرکە چەند لە خۆت ئەکات نزیك بوونەوە کوڕەکە ویستی ئیستاپ بکات و ڕاوەستێ، بەلاّم پێ ی نا لە بەنزین و باوکی وەبەر سەیارە کەوت کە سەیارەی ڕاگرت و دابەزین بینی لە کەللەی سەری باوکی داوە خوێن لە دەم و لووتی هاتووە، هەروەك چۆن باپیرەی مرد ئاواش باوکی مرد...........!

ئازیزان سزای کەسێکە کە زالّم بێت بەرامبەر دایك و باوکی.

20

# کچ ڕاگرتن پەشیمانییە

بسم الله الرحمن الرحیم

بەڕێزان.......

زۆر کەس هەن خوای گەورە بە لوتف و ڕەحمەتی خۆی منالّی پێداون، کچی گەنج و جحێلّیان لە مالّ هەیە، بە شوویان نادەن، چەندە پیاوی باش و بەڕەوشت دێن، بە شوویان نادەن، چاویان لە پارەو مالّی دونیایەو پارە چاوی کوێر کردوون بیرو هزریان هەر لای پارەیە، ئەیانەوێت کچەکانیان بە پارە بفرۆشن، کێ پارەی زیاتری پێدان بەبێ هیچ، پێوانەو ڕێکییەك تەنها پارە، ئەوانەی ئاوا کچیان لە مالّ دا ئەنێن، قژی سپی بهۆننەوە خوای گەورە لێیان قبوولّ ناکات، پیاوی وا هەیە بە کچەکەی یان خوشکەکەی ئەلّێت: یا ئەبێ ژن بۆ من بکەیت، یا قژی سپی بهۆنیتەوە، بەلاّم نازانێ چارەنووسی لە دەستی ئەو نییە، یەکێ لەسەرووی ئەو لە ئاسمانەوە

دەسەلآت هی ئەوە، یان بـاوکی وا هەیـە هەلوێـستی زۆر خراپـە لەگـەلّ کچەکەی، پیر ئەبێت بە شووی نادات، بەبیانووی ئەوەی ئەلێت: ئەبێت لە عەشیرەتی خۆمان بێت، خزمی خۆمان بێت، ئەی ئەوەی لە عەشیرەتی تۆ نییە، یا خزمی تۆ نی یە چی بکـات؟! ئـازیزانم بـۆ پەنـد وەرگـرتن ئـەم چیرۆکەتان بۆ ئەگێرمەوە:-

پیاوێکی ڕەزیل، هەموو خەمی تەنها پارەیە، پارە کۆکردنەوە، ئـەوە بیرو ئیشو کاری ڕۆژانەی ئەم پیاوە ڕەزیلە بوو، کچێکی زۆر ئاقلی هەبوو. زۆر ژیرو جوان بوو، هەرچەندە داواکاری زۆر بـوو، زۆر کـەس ئـەهاتن تـا بیخـوازن و خزمایـەتی دروسـت بکـەن، بـەلآم بـاوکی بەشـێوەیەکی زۆر ناشیرین وەلآمی ئەدانەوەو بەڕێی ئەکردن، هەموو خەمی تـەنها کەسـێك بێت، کە پارەی زۆر بێت، ئینجا کچەکەی پێ بدات. کچەکەی ڕۆژ بـەڕۆژ گەورە ئەبوو بەتەمەندا ئەچوو، جوانی کـەم بوویـەوە تـەلی سـپی کەوتـە قژی.تەمەنی گەیشتە ٣٠ سالّ باوکی بەشـووی نـەدا، گەیـشتە ٣٥ سـالّ باوکی هەربەشووی نەدا تووشی نەخۆشی بوو، نەخۆشـیەکی زۆر سـەخت، باوکی زۆر دکتۆری پێکرد بـەلآم هـەر چـاك نەبوویـەوە، لەسـەر تـەختی نەخۆشخانە کەوت حالی زۆر خراپ بوو.

تەلەفۆنیان بۆ باوکی کرد کە بگاتە نەخۆشخانە بە زووتـرین کـات، کچەکەت حالی زۆر خراپە کۆتـا هەناسـەی ژیانیـەتی، باوکیـشی بەپەلـە ڕۆیشتە نەخۆشخانە، بەلآم چۆن کچەی بینی، بەجلی بووکێنی یـا بـەجلی

نەخۆشخانە؟ کەچوویە نەخۆشخانەبینی هەم و کەسوکارو خزمانی لەوێن و کۆبوونەتــەوە، کــچەش داوای بــاوکی ئــەکات، خۆشەویــستانم ئــەبێت چ کارێکی بەباوکی بێت؟! وتی: باوە گیان سەرت بهێنە پێشەوە باوکی وتــی : بەڵێ رۆڵە گیان وتی: دوعایەك ئەکەم بڵێ: امین باوکی وتی: بۆچی؟ وتی تەنها بڵێ امین (٣) جار دوعای کرد و بەباوکی وت بڵێ: امــین باوکیــشی ئەی وت: ئەبێت چ دوعایەك بکات!! زۆر حاڵی تێك چوو پێــی وت: رۆڵــە گیان ئەو دوعایە چ دوعایەك بوو ئەتکرد؟ ئەمیش وتی: ئــەم وت خوایــە گیان باوکم مــەحروم بکــەی، لەبەهەشــت چــۆن منــی مــەحروم کــرد لــە شووکردن و ماڵو منداڵی خۆم، ئینجا گیانی پــاکی دەرچــوو، کۆتــایی بــە ژیانی هات و مرد.

باوکیشی ئەم حەسرەتەی لەگەڵ خۆی بردو ئاگری لــە ژیــانی بــەرداو کچەش رۆیشتە قیامەت حاڵی بردە لای پەروەردگار، باوکیشی لەم ژیانــە بەو داخەوە رۆیی..

ئازیزان چەند کەسمان کچەکانمان قژی سپی هۆنیوەتەوە؟ چەند کــەسمان کچەکانمان مــردوون و بەشــوومان نــەداون؟ چــەند خوشــکمان قــژی ســپی هۆنیوەتەوە، وریا بن تەنها دوعایەك بکات، ئاهی ئــەتانگرێت بەشــوویان بدەن، با دەوڵەمەندیش نەبن، تەنها نانی رۆژانەیان هەبێت بۆخۆیان دەژین و سوپاسگوزار ئەبن ....

ئازیزان شەپۆلی فەساد ئێمەی داگیر کــردووەو رووی لــە کوردســتان

کردووە، هاتۆتە نێو ماڵەکان، کچەکانتان بدەن بە کەسانی ڕێك و پێك، ئێمە لە ئیمامی عومەر باشتر نین، بۆ پارێزگاری لە ئابڕوومان کاتێ حفصەی کچی بێوەژن بوو، چوو بۆ لای ئیمامی عثمان وتی: کچم بێوەژنە و ئەیدەم بە تۆ. وتی: تازە خێزانم ئەمری خوای کردوە نییەتم نییە ژن بهێنم، چوو بۆ لای ئەبوبکری صدیق(ڕەزای خوایان لەسەر بێت)وتی: کچەکەم ئەدەم بەتۆ. وتی جارێ نازانم، تابەقسمەت پێغەمبەر (ﷺ)بوو عەیب نییە، بگەڕێن بەدوای کوڕی باش بۆ کچەکانتان، چۆن کوڕەکان ئەگەڕێن.

ئازیزان زۆرمان زوڵم لە کچەکانمان، لە خوشکەکانمان کردووە ، بابین بە هاوەڵی پێغەمبەر(ﷺ) ئازیزان پێغەمبەر (ﷺ) دانیشتبوو فەرمووی: کۆمەڵی موسڵمانان هەرکەسێ (٣) کچی بەڕەوشت پەروەردە بکات و بەخێوی بکات بیاندات بە شوو، لەتەك منە لەبەهەشت. هاوەڵێك وتی: ئەگەر دوو کچیش بێت؟ ئەگەر دوانیش بن، ئەی‌و وتووە دوو کوڕ، چونکە کوڕ خۆی بۆخۆی ژن ئەهێنێ ، بەڵام کچە لە ماڵە چاوی لەدەستی براو بارکییەتی، ئازیزانم بۆخۆتان ئەو بەرپرسیاریەتییە لەسەر خۆتان لاببەن، لە ڕۆژی قیامەت خوای گەورە پرسیار ئەکات، ئەگەر ئێمە کەمتەرخەمیمان کردبێ بەرامبەر کچەکان و خوشکەکانمان. جا هیوادارم پەندی زیاتر بۆخۆتان وەربگرن. تا چیرۆکی تر بەخواتان ئەسپێرم.

چیرۆکی ٢١

# لەدەرگای خەڵك مەدە، لەدەرگات دەدرێت

بسم الله الرحمن الرحيم

**الحمدلله رب العلمين والصلاة والسلام على حبيبنا محمد (ﷺ) وعلى اله وصحبه اجمعين.**

بەرێزان... هەزاران ڕەحمەتو بەرەکەتو میهرەبانی برژێ بەسەرتانا، خوایە گیان بەناوە جوانەکانت لێت ئە پارێمەوە، داوات لێ ئەکەمو ئەڵێم یاألله یارحمن یارحیم یاغفور یاکریم یاحیو یاقیوم یابدیع السموات والارض ویاألله لە گونا همان خۆش بیت، دڵمان بە نووری خۆت ڕۆشن بکەیتەوە، دڵێکی زیندوومان پێ ببەخشە دڵە کانمان پاك بکەیتەوە، یارەبی خۆشەویستی خۆتو پێغەمبەرەکەتمان پێ ببەخشە، خوایە گیان چاوی دڵمان بکەیتەوە، تاهەقو ناهەقو راستیو ناراستی ببینین، خوایە

گیان شیفای نەخۆشمان بدەیت، یارەبی یارمەتی کچان‌و کورانی گـەنج‌و لاو بدەیت، خوایە بمان پارێزە لە هەر پیلانێـك کـە ئـە یانـەوێ کـورد بـەرەو فەسادو وێرانی بەرن یاأکرم الاکرمین یاالله  أمین.

ئازیزان شەرەف‌و کەرامەت زۆر هەستیارن، هی ئەوە نی یـە ئینـسان هیچ کات قـسەی لـە سـەر بکـات‌و گفـت‌و گـۆی لەسـەر بکـات، بۆیـە پێغەمبەر (ﷺ) ئەفەرمووێ :( من قتل دون عرضة فهو شهيد) کەسـێك لە سەر ناموس‌و شەرەفی خۆی بکوژرێت شەهیدە، ئازیزانم کەسانێك هەن بیرناکەنەوە کە خوشك‌و دایکی خەڵك شەرەف‌و کەرامەتیانن، بیرناکەنـەوە کەنابێت سووکیان بکەن‌و ئیهانەیان بکەن، ئـەبێت ئاگـادار بێـت لـەوەی کەبیەوێت لەناویان ببات، یان بە چاوی کەم سەیریان بکات، یـان بیـەوێت لە کەداریان بکات، چۆن ئێمە پێمان ناخۆشـە خـەڵك سـەیری خوشـکمان بکات، ئاواش بۆخۆت پێت ناخۆش بێت کەئەمەش خوشکی خەڵکە، کچی خەڵکە، خۆشەوسیتان ئەبێت پێوانەی نەفسی خۆی بکات، وریابـە خـەڵك شەرەف‌و کەرامەتیان هەیە، ئەبێت کەسـێك ئاگـای لـەوەبێ، کـە خـەڵك ئەیانەوێت شەرەف‌و ناموسیان پارێزراوبێت، کاتێك ئەتەوێت لە کەداریان بکەیت، دەبێت ئاوابیت بـۆ خـەڵك بـەدوای شـەرەف‌و کەرامـەتی خـەڵك نەکەویت لەگەڵما بن بۆ ئەم چیرۆکە:- کـورێکی گـەنج  لـە خێزانەکەیـدا کەس لێی ناپرسێت‌و دایـك‌و بـاوکی ناپرسـن، کەئـەم کـورە چـی ئـەکاو هاورێی کێیە؟ ئەم کورە دەوڵەمەندە، هەموو رۆژێ دوای دەوام لە کۆلێژ،

لەگەڵ چەند هاورێیەکی دەگەرێن، سەیری کچی خەڵك ئەکەن‌و بەدوایان ئەکەون، گاڵتەیان پێ ئەکەن، ئەزیەتیان دەدەن، ئافرەتیش هەن ساویلکەو دڵ سافن بەم قسە شیرنانەیان ئەخەڵەتێن، زۆر ئافرەت هەن بەتەلەفۆن بە ئینتەر نێت هەڵخەڵەتاون، وریابن خوشکانی مـن شـەرەفی خۆتان مەدەنەدەست ئینسانێك کە وەکو گورگ وان، وریابە کەسێ سەیری کردیت سەیری مەکەوە، خۆشەویستان ئەم کورە گەنجە، زۆر کچی هەژاری هەڵخەڵەتاندبوو، رۆژێکیان هەر بەتەلەفۆن ئافرەتێ ئەناسێت‌و قسەی لەگەڵ ئەکات ژوان دائەنێن بۆ یەکتر بینین، یەکتر ئەبینن‌و پەیوەندی دروست ئەکەن، جارێکیان کورەکە داوای سەر جێی لێ دەکات، بەڵام کچەکە رازی نابێت، ئەڵێت وەرە بۆداوام، کورەکە ئەڵێت ناهەر ئەتهێنم بەڵام ئێستانا، ئافرەتەکە هەر رازی نابێت‌و کورەکە ئەڵێ دەنگتم لە مۆبایل تۆمار کردووە، ئەیدەم بەدەست دایك‌و باوك‌و براکانت کچەکەش ئەڵێ: چی ئەڵێی، ئامادەم تەنها ئەم قسانە بلاو مەکەوە. ئەگەر روویان پێ نەدەی فرسەتیان نەدەی ئاوانابێت، زۆری قسە لەگەڵ کردوو بە ئافرەتەکەی ووت ئەگەر هەر چییەك ئەڵێم نەیکەیت، گڕ لە شەرەف‌و کەرامەتت بەر ئەدەم‌و ئەتسوتێنم، ئافرەتی داماو وادەی لەگەڵ داناو وتی: لەم شوێنە ئەتبینم، بەڵام نەچوو دوای ماوەیەکی کەم دووبارە کورەکە قسەی لەگەڵ کردەوەو هەوڵی لەگەڵدا چونکە هێشتا کینەی لە دڵ مابوو کەجاری پێشوو نەچووبوو بۆ وادەدانان‌و یەکتر بینین، دیسانەوە هەڕەشەی

لیّ کردەوە، ئافرەتەکەش وتی: دێم، ئەم کورە نامەردە چەند هاوڕێیەکی هەبوو، پێی وتن ئێستا کچێك دێتەلام، ئێوەش بەهەر چوارتان چیتان پێ خۆشە لەگەڵی بکەن، وای لیّ بکەن نەتوانێ بڕیتو بمرێت ئینجا کەتەواو بوون پێم بڵێنو بانگم بکەن، بۆخۆی رۆیشت ئافرەتێکی جوانو رێكو پێك هاتو وتی فلاّن لێرەیە؟ وتیان فەرموو، ووتی ئیشم پێیەتی، ئەمانیش گرتیانو بردیانە ژوورەوە، ئەوەی پێیان خۆش بوو کردیان، ئافرەتە داماوەکە خەریك بوو ئەمرد، ئینجا بانگی کورەکەیان کرد، وتیان وەرە کارمان تەواوبوو کورە هاتو وتی: دەستتان خۆش، بەلاّم کەچووە ژوورەوە بینی، یەکراست بوورایەوە، زۆر هەوڵیاندا لەگەڵی کەهاتەوە هۆش خۆی وتیان: چی بووە؟! وتی: ئەوە چیتان کردووەتەوە خوشکمە! وتیان: خۆت وتت ئافرەتێ دێت بۆ ئێرە هیچ ناو نیشانێکت نەدا بەئێمە، هەڵەو خەتا لە خۆت بوو، خۆت وات وت ئینجا ئافرەتەکەیان هەلگرتو گەیاندیانە نەخۆشخانە. بزانین ئەمە چۆن ڕوویدا؟ ئازیزانم ئەم ئافرەتەی دۆستی بوو، بۆجاری دووەم ترساو نەیتوانی بچێت، لە ماڵی کورەکە بەخوشکەکەیان وت: برۆ براکەت بدۆزەرەوە، باوکت ئیشی پێ هەیە، ئێستا لە فلاّن شوێن لەگەڵ هاوڕێیەکانیەتی، خوشکیشی هیچ لە باسەکە نازانێتو تووشی ئەم حاڵەتەبوو.

وریابن یاری بەکەرامەتی خەڵك مەکەن( من دق دُق) لەدەرگای خەڵك مەدەن لەدەرگات نەدرێتەوە، ئەوەی دەرگای خەلکی نەهەژێنێ،

دەرگای ئەهەژێنرێتەوە، وریابن شەرەف‌و کەرامەتتان بپارێزن، ئەم کورە خۆی شەرەف‌و نامووسی خۆی لەناو برد، بێ پەروەردەیی خۆی بوو، ئاوای بەسەرهات، ئەبێ دایك‌و باوك ئاگای لە منالّە کانی بێت، ئازیزانم پەندوو عیبرەتی زۆری تێدایە( **من ألقى السمع وهو شهيد**) کەسێك گوێم لێ رابگرێت(**فستذكرون ما أقول لكم وافوض امرى الى الله ان الله بصير بالعباد**) غافر: ٤٤ بەبیرت دێت کەمن هەقم ئەووت ئەم وت: شەرەف‌و کەرامەتی خەلّك بریندار مەکەن، باشەرەف‌و کەرامەتتان بریندار نەکرێت گەورەترین شتێك کە لای ئینسان پارێزراو بێ شەرەف‌و کەرامەتیەتی، وریابن بی پارێزن بۆ ئەوەی بەرووسپیەتی بەخزمەت خوای گەورە بگەن.

**( السلام عليكم ورحمة الله وبركاته)**



# هاوڕێی خراپ

بسم الله الرحمن الرحیم

خۆشەویستان ئەبێ پیاو لە ماڵێ لەگەڵ ماڵو منداڵی خۆی قسەی خۆش بێت، ڕوو خۆش بێت، نەوەك هەمیشە ڕووگرژو تووڕە بێت، کەس نەوێرێت قسەی لەگەڵ بکات، منداڵەکانی بترسنو نەتوانن بانگیشی بکەن، کەچی لە دەرەوە بە پێچەوانەوە قاقای پێکەنینی بێو ڕووخۆش بێت، خۆشەویستانم ئەبێ پیاو لەگەڵ ماڵو منداڵی ڕێك پێك بێت، ئیمامی عومەر( ڕەزای خوای لێ بێ) ئەفەرموێت: ئەبێ پیاو لە ماڵێ وەکو منداڵەکەی وابێ، بەڵام کەهاتە دەرەوە پیاوبێت) ئازیزان ئەبێ وابی لەگەڵ ماڵو منداڵت، وەکو ئەوان هەڵسو کەوت بکەیت، لە دەرەوەش پیاوێکی سەنگینو ڕێکبیت، خۆ ئێمە کەسمان لە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) پیاوتر نینو زاناترنین، بزانن ئەو چۆن بوو لەگەڵ منداڵی ئیمامی علی

(رەزای خوای لەسەر بێ) یاری ئەکردو لەسەر پشتی خۆی دای ئەنان، ئەی فەرموو: ئەوەی لەسەر پشتی دانیشتوون جوانەو ئەوەی لەسەر پشتیشتی هەرجوانە. سەیربکەن لەو دەربرینە جوانەی، یاریشی لەگەڵ کردوون بەلام ئەبێت هەیبەتی نەشکێ‌و قسەی نەشکێ هەرشتێ سنوری خۆی هەیە بەتایبەت لەگەڵ خێزان ئەبێ دابنیشی، قسەت بەلوتفو خۆش بێت، جازۆر جار تورەیی پیاو بۆتە کێشەی زۆر گەورە بۆ ئەم جارە پەند لەم چیرۆکە وەرئەگرین... پیاوێك ئەبێت، زۆر لەگەڵ ژنەکەی خراپەو هەموو رۆژ لێی ئەدات، بەم لێدانەی راهاتووە، ئازیزان پێم سەیرە، خۆ ئەمە گەورەیی‌و ئازایەتی نییە، کە ئەڵێن فلان لە ژنەکەی داوە!! ئازیزان لێی بتۆرێ، قسەی لەگەڵ مەکە تا پەند وەرگرێ، بەلام ئازایەتی نییە لێی بدەیت. ئەم پیاوە رۆژێك زۆری لە خێزانەکەی ئەدات، تالە ژێردەستی مرد، کەمرد زۆر پێی تێك چوو چی بکات؟ چی بڵێت؟ تازەمردووە، هەڵسا چوو بۆلای هاورێیەکەی‌و پێی ووت چی بکەم؟ هاورێیەکەشی وتی: ئێستا بچیتەلای ماڵی خەزوورت، پێیان بڵێت بە لێدان کوشتوومە لێت خۆش نابن، وتی: بڕۆوە لەبەر دەرگا بوەستە تا کوڕێکی جوان دێت ئەم کوڕە بانگ بکە ژوورەوەو بیکوژە، کە کوشتت جلی لەبەر بکەرەوەو لەتەنیشت ئافرەتەکە دای بنێ، ئینجا بڕۆبانگی ماڵە خەزوورت بکەو با ببینن، ئەوانیش ئەوکات پێت ئەڵێن دەست خۆش، ئینجا بانگی من بکەو هەردووکیان دەشارینەوە، چووە ماڵو لەبەر دەرگا ڕاوەستا

تاکوڕێکی جوانو ڕێك هات، ئینجا بانگی ژوورەوەی کردو کوشتی کەکوشتی رووتی کردەوەو لەتەنیشت ئافرەتەکە درێژی کرد، ئینجا بانگی ماڵی خەزووری کردوو پێی وتن: کە ئافرەتەکەی کوشتووە لەبەر شەرەفو کەرامەتی خۆی، چونکە ئافرەتەکە ناپاکی لەگەڵ کردووە، باوکیو برای کەسەیری ئەکەن پێی ئەڵێن دەست خۆش کوشتت، ئیتر ئەوە کچی ئێمەنییە برۆ بەتەنها بیشارەوە باهەر کەس نەیزانێ ڕۆیشت، ئینجا چوو بۆلای هاورێکەی وتی هەموو شتێك تەوابوو، هاورێکەی لەگەڵی چووە ماڵ تا تەرمەکان بشارنەوە کە هاورێکەی چووە ژوورەوە ڕاست بوورایەوە، زۆری لەگەڵ کرد تابە هۆش خۆی هاتەوەو پێی وت: ئەوە چییە بۆ بوورایتەوە؟؟ هاورێکەی وتی: ئەوە چیت کردووە؟ وتی: چیت ووت ئاوام کردووە بۆ؟! وتی: خۆ ئەوە کوڕی منە کوشتیتت وتی: بەخوا نەمزانییە کوڕی تۆیە، تۆوتت کام کوڕ گەنجو جوانە، ئەو بانگی ژوورەوە بکە، من چۆن بزانم کوڕی تۆ وەبەر دەرگای ماڵی ئێمە دادێت، هەر نەمناسیوە ئیتر ئەوان خۆیانو خوای خۆیان.

ئازیزان ئەمە سزای هەموو کەسێکە کە ڕێگای خراپو بوختان دابنێت پێغەمبەر (صلی الله علە وسلم) ئەفەرموێت:( المستشار مؤتمن )، ئەبوایە ڕێگای باشی بۆ دابنێت، نەك بچێت بوختان بکاتو یەکی تریش بکوژرێت بۆیەخوای گەورە جەرگی ئەمی سوتاند، کە ئەم ڕێگا خراپەی داناو تۆڵەی خراپیەکەی کردەوە، جا ئازیزان با پەند وەرگرین...

یەکەم: نابێت ئینسان لە خێزانەکەی بدات، ئەم پیاوە خۆی تووشی دوو قەتل کرد، ئیتر خۆی ڕووڕەشی دونیاو قیامەت کرد.

دووەم: ئەوانەی کە پرسیان پێ ئەکەیت، دەبێ کەسی رێكو ئەمین بن، نەك پرس بە کەسانێك بکەیت وەکو گورگ بن.

سێ یەم: ئەگەر کەسێك پرسی پێ کردیت، رێگەیەکی وادابنێ کە بەرەو خێرو خۆشیو چارەسەر بچێت نەك تۆ رێگەیەکی وا دابنێیت، بەرەو وێرانیو خەجالەتی بچێت.

چوارەم: دەبێت زۆر وریای خۆتان بن، بزانن خوای گەورە چۆن هەردووکیانی ریسواکرد، ناتوانن لای خەڵك باسی بکەن، چونکە ئەکەونە بەرلەعنەتو قسەی خەڵك، ئەبێت تا دونیاماوە ئاخ هەڵکێشن... ئازیزان پەند وەرگرن، تا چیرۆکێکی تر.

**السلام عليكم ورحمة الله وبركاته**



# بازرگانی ناپاك

**بسم الله الرحمن الرحيم**

بەرێزان...

خوای گەورە وای کرد دوای ساڵی ١٩٩١ کوردستان ئازادییەك‌و هەناسەیەکی خۆشی‌و ئارامی‌و کرانەوە لەگەڵ دەوڵەتانی دەوروبەر پەیدابوو، بازرگانەکان بازرگانییان کرد لەگەڵ دەوڵەتانی دەرەوە، هێنانی هەندێ کەل‌و پەل‌و پێداویستی ژیان، هەندێ لە خەڵك ژیانی خۆیان پێ دابین کرد، تارادەیەك ئاسودەیی پەیداکرد، ئەمە نیعمەتی خوای بالادەستە، بە ئێمەی بەخشی، بەڵام ئەوەی جێی تێرامانە بازرگانەکانن، ئەبێ وریای خۆیان بن، ئاگاداربن کاتێ سەفەری دەرەوە دەکەن‌و ئەم ئوتێلانەی دەرەوە هەمووی فروفێڵ‌و پیلانی تیا دائەنرێت،

ئەم گەنجو بازرگانانە تووشی ئەم تەڵەو داوانە ئەبن، جائەی ئەوانەی خۆشیو شادی دێنن، خزمەت ئەکەن، بازرگانەکان... لەگەڵم بن ئامۆژگاری وەرگرن، تائەم چیرۆکە راستەقینەتان بۆ بگێرمەوە:-
بازرگانێکی گەنج، رێكو بالاّ بەرزو دەوڵەمەند وەکیلی چەند کۆمپانیا، هەڵئەستێ سەفەری لوبنان ئەکات، لەلوبنان لەئوتێلێکی راقی دائەبەزێتو لەوێ لە هۆڵەکە دادەنیشێتو ئەبینێ کوڕێکی گەنج لەگەڵ ئافرەتێکی تەمەن بچووك دانیشتوون، ئینجا سەیری یەکتری ئەکەنو دوایی دێنەلای کوڕەکەو قسەی خۆش ئەکەن، بازرگانی ئێمەش ئەڵێت: بۆنانی ئێوارە دەعوەتی خۆمن، ئەوانیش رازی دەبن، پاشان ئەم کوڕە گەنجەی لەگەڵ کچەکەیە، شەودرەنگ ئەبێو ئەڵێ ئەم کچە بائەم شەوو میوانی تۆ بێت، ئەڵێ چۆن؟ ئەڵێ با لات بێ تابەیانی، ئینجا تابەیانی لەگەڵی ئەبێتو بۆ بەیانی ئەڕوات. دوایی کچێکی تری جوانتر لە خۆی لەگەڵ خۆی دەهێنێ، ئەزانێ کام ژوورهی ئەوەو ئەیباتەلایو بە یەکتریان دەناسێنێ، بازرگانەکەش زۆری پێ خۆش ئەبێت، ئەڕۆنە بازاڕ ئەم کچانە دەیبەن بۆ بازاڕی زێرنگرانو بەرامبەر دوکانی زێر ئەوەستن بە دیار زێرەکانەوە ئەڵێ: ئەم زێرانەتان پێ جوانە، بای (٥) ملیۆن لیرە زێریان بۆ ئەکڕێت تانیوەڕۆ لای ئەبن، دوایی ئافرەتە جوانەکە ئەڵێت: ئەم شەو لە ڤێلای من دەعوەتی خۆمیت، کوڕەکەش زۆری پێ خۆش

دەبێتو رازی دەبێ ناو نیشانی وەرنەگرێو دەچێت، سەیرئەکات چەند پیاوێك لەسەر مێزی قومار دانیشتوون قومار ئەکەن، ئافرەتەکەش پێش وازی لێ ئەکات، ئەمیش خۆی بەبازرگانێکی گەورە ئەزانێتو ئەڵێ منیش قومارئەکەم بەدۆلار قومار دەکاتو(٥) پێنج ملیۆن لیرە لەسەر ئەم مێزە ئەدۆرێنێ، دوایی بیری دێتەوە کە پارەی زۆری لانەماوە، ناتوانێت هەموو شتەکانی بکڕێت، بە ئافرەتەکە ئەڵێ: بڕۆین کەمێك رابوێرین، لەگەڵ ئافرەتە ئەچنە ژوورەوە دوایی دووپیاوەکە بەژوور دەکەونو ئەڵێن ئێستا پێنج ملیۆن لیرە نەدەیت، دەمانچەرائەگرنو ئەڵێن: ئەتکوژین ئەمە جگە لە پێنج ملیۆن لیرەی لە قومار دۆراندوویەتی، پێی ئەڵێن چەند مانگە پیلان دائەنێین تاتۆ بەبەرکەوتوی وازناهێنین تا نەکوژراوی پارەکەبدە، پارەکەیان لێ سەندوو دەستو چاویان بەستو بردیانە شوێنێکی دوور فرێیاندا. ئەمە سزای کەسێکە کەبەدوای ئارەزوو نەفسی خۆی بکەوێت، ١٥ ملیۆن لیرە لە شەوو رۆژێکدا سەیرکەن بیری نەکردەوە، جا ئازیزان پەندوو ئامۆژگاری..

یەکەم: ئەبێ بازرگانەکان بەتەنیا سەفەر نەکەن، پێغەمبەر(**صلی الله علی وسلم** ) ئەفەرمووێت (**الراکب شیطان والراکبان شیطانان وثلاثة الرکب**) لە (٣) کەس ئینجا شەیتان واز ئەهێنێ، ئەگەرنا تووش بن ئەخڵەتێن، تکایە بەتەنیایی سەفەر مەکەن.

دووەم: لەم ئوتێلانە دامەبەزن کەجێی فێڵ‌و باندەکانن، سەیرکەن ئەم پیاوە بێ ئەوەی بزانێ، چۆن لە خشتەیان برد !!.

سێ یەم: مەردبن خۆتان گوناهـ بارنەکەن، لەگەڵ ئەم ئافرەتەناپاکانە، کارەکانتان بکەن‌و بەیەکەوە بگەڕێنەوە هوتێل بیری ماڵ‌و منداڵتان بکەنەوە خۆتان بپارێزن نامووس‌و کەرامەتتان لەبیر بێ چونکە زۆر هەستیارن پێویستی زۆری بەبیر کردنەوەو تێرامان هەیە، خوای گەورە هەموو لایەکمان بپارێزێ.

السلام عليكم ورحمة الله وبركاته

٢٤

# تــــۆڵــــە

بسم الله الرحمن الرحيم

یارەبی خوایــە تــەبایی بخەیتــە نێوانمــانو نێــوان خێزانــەکانو دڵیــان بەیەکەوە گرێ بدەیت   أمین.

زۆر جار کاتێ هەواڵت پێ ئەدەن منالێکتان بووە، زۆر کــەیف خــۆش ئەبی، بەتایبەت ئەگەر منالی یەکەم بێت تائەگاتە چەند منالێــك وای لێ دێت کە بلێیت منالێکتان لە دایك بووە، پێی ناخۆش ئەبیو تاقەتی ئەچێ بــە پێــچەوانەی منــالی یەکــەمو دووهــەم، بــۆوای لــێ دێــتو پێــچەوانە ئەبێتەوە؟! ئەی بۆ لە منالی یەکەم مــەولودوو شــیرینیو نوقڵــت دابــەش کرد، ئێستاش بۆیەم هەواڵە دڵ تەنگ ئەبیت؟ جا ئازیزان ئەم سیفەتانە لە ناو خێزانەکانی ئێمە هەن تادەگاتە ئاستی تەلاق ئیهانەکردن، بــۆ ئــەوەی دەرسو عیبرەت وەرگرین، لەم کەسانە گــوێ گــرنو لەگــەڵم بــن بــۆ ئــەم

چیرۆکە... کوڕێکی گەنج مامۆستایە لە قوتابخانە دەوام ئەکات، لە کاتی دەوام لەگەڵ ئافرەتێ یەکتر ئەناسن کە لەگەڵی مامۆستایە دڵیان یەکتر ئەگرێت، بە یارمەتی چەند مامۆستایەك ئەبن بە هاوسەری یەکترو لەگەڵ یەکتر ئەژین دوای ساڵێك خوای گەورەو باڵادەست کوڕێکیان پێ ئەدات، زۆر کەیف خۆش ئەبن، سوپاسی خوای گەورە ئەکەن، دوای تەواو بوونی مۆڵەتی مناڵ بوون، ئافرەتەکە ئەچێتەوە دەوامو کێشەی زۆریان بۆ دروست ئەبێتو نازانن مناڵەکە لە کوێ دابنێن، تا ئافرەتەکە لە دەوام دێتەوە، هیچ کەس نییە ئاگای لەمناڵە کەیان بێتو لەگەڵ ئەم حاڵەو کێشە زۆرەیان، ئافرەتەکە جارێکی تر دووگیان ئەبێ، مێردەکەی داوای لێ ئەکاتو پێی ئەڵێ دەبێ لەباری بەریت، ئەمیش ئەڵێ چۆن ئیشی وابکەین؟! ئەیباتەلای دکتۆر تالەباری بەرن، بەڵام دکتۆرەکە ئەڵێت من ئەم کارە ناکەمو ئەم گوناهەناکەم، بابچێت وەرزش بکات یان ڕابکات تالە بەری ئەچێ ئەڕۆن مناڵەکە لای دراوسێیەکیان دادەنێنو ئافرەتەکە ئەبات بۆ ناوچەیەکی شاخاوی ئافرەتەکە ئەوەندە ڕائەکاتو سەر ئەکەوێو دێتە خوارەوە، تا هیلاك دەبێ، ئەگەڕێنەوە ماڵ دەبینن، لەبەر دەرگای دراوسێکەیان قەرەباڵغی زۆر هەیە، ئەچنو سەیر ئەکەن مناڵەکەیان لە سەر بان بەربۆتەوەو مردووە زۆر خەفەت ئەخۆن ئەم جارەیان دوعائەکەنو ئەپاڕێنەوە کەمناڵەکەی ناوسکی لەبار نەچێ، ئەچنەلای دکتۆر یارمەتییان بدات تا مناڵەکە لە بار نەچێت، دکتۆرەکەش ئەڵێت

زۆرنالەبارە، نـاتوانم هـیچ کـارێکی بـۆ بکـەم، بـرۆن دوعـا بکـەنو لـە پەروەردگار بپارێنەوە ئەگەر خوای گەورە مهرەبانیتان لەگەڵ بکـات، زۆر دوعا ئەکەنو ئەپارێنەوە تا ئەم منالە یان لە بار نەچێ‌و خـوای گـەورەش بە لوتفو میهرەبانی خۆی، یارمەتییان ئـەداتو ئافرەتەکـەش منالەکـەی لەبار ناڕوات. جا ئازیزانو بەڕێزانم، نابێت سوپاس گوزار نەبن لە بەرامبەر نیعمەتەکانی خوای گەورە خۆشە ویستان ئافرەتی واهەیە ئەڵێ: کاتێ دوا منالم بوو، زۆر بێتاقەت بووم خەفەتم ئەخوارد، بەلام لە هەموویان باشـتر بووە بۆم یارمەتی داوم بەرەکەتی لەگـەڵ خـۆی هێنـاوە. خـوا ئـەزانێت( **لاتدرون أيهم أقرب لكم نفعـاً)** البقـرة: ١١، نـازانن کامیـان باشـترە بۆتان، خێرو بەرەکەتە بۆتان.. باپەند وەرگرین:

یەکەم: ئەکەن سوپاس گوزار نەبن، لە بەرامبەر نیعمەتـەکانی خـوای گەورە هەمیشە سوپاسی خوابکەنو منالەکانتان بە نیعمـەتی خـوای بـالا دەست بزانن.

دووەم: ئەگەر ئەتانەوێ کێشەتان بۆ دروست نەبێ‌و کێـشەتان نـەبێ، منالتان ناوێت، رێگـە زۆرە بیگریتەبـەر تـا منالتـان نـەبێ، هەرچـەندە زۆربەی زاناکان ئەڵێن(تنظـيم النـسل) گوناهـەو ڕای جیاوازیـان لەسـەر هەیە، بەلام بەمەزەنـدەی مـن بۆرۆژگـاری ئـەمڕۆ گونـاه نییـە چـونکە پەروەردەکردنی منالی زۆر، ئەمڕۆ زەحمەتە، پەروەردەیان زەحمەتە نـەوەکو بەخێو کردنیان، زەحمەتە لـەلاوازی ئیمانیـەتی (نحـن نـرزقهم وايـاكم ان

قتلهم كان خطئاً كبيرا) خوای گەورە ئەفەرمووێت: رزقی ئێوەو ئـەوانیش ئەدەم، بەرێزانم سوپاس گوزار نەبوون زۆر ترسناکە، ئەم کێـشانە زۆرە لـە ناو خێزانەکان بەدەنگەدەنگ‌و کێـشە چارەسـەر ناکرێـت، وریـابن خـوای گەورە هەمووشتێ ئەبینێ‌و ئەبیستێ.

**السلام عليكم ورحمة الله وبركاته**

وانەی ٢٥

# بەڵای بچووك، بەڵای گەورە وەلا دەنێت!

بسم الله الرحمن الرحيم

الحمدلله رب العلمين الصلاة والسلام على حبيبنا محمد (ﷺ) وعلى اله وصحبه أجمعين..

السلام عليكم ورحمة الله وبركاتهُ.

بەرێزان......

رەحمەتو میهرەبانی خوای گەورەو میهرەبان، بڕژێ بەسەر دڵو دەروونتان، خوایە گیان لە گوناهەکانمان خۆشبیت، دڵمان بەنووری خۆت رۆشن کەیتەوە، یارەبی خوایە بمانکەیتە موسڵمانی صالحو بەسەر بازی خۆتمان حساب بکەی، خوایە گیان چۆن ئێمەت جوان کردووە بە ئاینەکەت، ئاواش ئێمە ئاینەکەت جوان بکەین، یارمەتیمان بدەیت بۆخەمی ئاینەکەتو سەرکەوتنمان بەقسمەت بکەیت، خوایە گیان

هەرتۆی پەناو یارمەتی دەرمان، خوایە موسلْمانانی جیهان یارمەتی بدەی سەر کەوتن‌و خۆشییان بە قسمەت بکەی. آمین.

بەرێزان هەموومان کێشەمان بەسەر دێت تووشی خەم‌و پەژارە ئەبین، بەلاّم برِوابکەن هیچ شتێ بەبێ حیکمەت نییە، هەرچی لە ژیانمان روونەدات، ئەگەر موسلْمانی راست بیت، ئێمە لەهەموو ژیانمان خۆمان ئەسپێرین بەپەروەردگارمان، ئەڵێین بە خێرو چاکە بۆمان بنووسەو بەلاّ گێرمان بێت، هەرشتێکت بەسەرهات چاوەرێی زیاتربکە چونکە خوای گەورە یارمەتی داویت‌و بۆتی سووك کردووە، بەلاّی گەورەتری بۆگێراویتەوە، لەگەلْم بن بۆئەم چیرۆکە:-

لە شاری بەغداد پیاوێك شوفێری پاس ئەبێ، لە هێڵی خێرا ئیش ئەکات بەشی رۆژانەی پەیدا ئەکات، بەلاّم لەم هێڵە خێرایە نابێت بەهیچ شێوەیەك ئۆتۆمبیل تێك بچێ‌و لەشەقام بوەستێ، ئەم شوفێرە لە هێڵە خێراکان پاسەکەی پەنچەر ئەبێ‌و ناتوانێ برِوات، زیاتر لێی تێك ئەچێت دائەبەزێت تا چاکی بکاتەوەو چەند گەنجێکیش دائەبەزن یارمەتی بدەن، بەر لەوەی تەواوبن پۆلیس دێت‌و ئەیگرێت، ٢١ کەسی ناو پاسەکە وتیان ئازادی بکە، پۆلیسەکە بەقسەی هیچ کامیانی نەکردوو وتی هەر ئەیگرم دەستیشی بەسەر پاسەکەدا داگرت، بۆماوەی یەك هەفتە پاشان پاسەکەی وەرگرتەوەو دەستی بەئیش کردەوە، دوای ساڵێك لەسەر ئەم رووداوە لە بەغدا ئەچێ بۆ شاری (حلله) لە خاڵی پشکنین رِای ئەگرن‌و سەربازەکە

سەیری ڕەقەمی پاس‌و شوفێرەکە ئەکات، بانگی سەرۆکەکەی ئەکات ئەڵێ: وەرە ئەم شوفێرەم گرتووە، کەلەبراکەتی داوە، هەمان ژمارەو هەمان پاسە، دووسەرباز ئەڵێن ئێمە ئاگامان لێ بووە، تۆ لەبرای ئەم پیاوەت داوە کوشتووتە چەندە وتی: من نەهاتوومە ئەم ڕێیەو من نیم، بەلاّم گرتیان‌و لێ پرسینەوەیان لەگەڵ کردوو دووسەربازەکە شاهێدی لەسەر ئەدەن لە فلاّنە کات ئەم ژمارەیەو ئەم پاسە، (٢٠) ساڵ حوکم ئەدرێ ئەیخەنە ژوورەوە، بەلاّم عادەت وایە یەك مانگ تەمیزی هەیە، تاگۆران بەسەر حوکمەکەی بێت، ئەگەر بەڵگە بێنێت، پارێزەرەکەی ئەڵێت: بیربکەوە لەم ڕۆژوو کاتەدا چیت کردووە لە کوێ بوویت؟ خەریکی چ بوویت؟ شوفێرەکەش زۆر بیرئەکاتەوە دوایی ئەڵێ من لەم کاتە لای پۆلیس دەست بەسەر بووم لەم ڕۆژە، پارێزەرەکەشی ئەچێتەلای(فەرمانگەی پۆلیس )ی هاتووچۆ ئەڵێت بەم ناونیشان‌و بەم کاتە ئەم کەسە لای ئێوەگیراوە، ئەوانیش ئەڵێن: بەڵێ لەم کاتە گیراوە، خۆشەویستان (٢١) کەسی ناوپاسەکە بەم پۆلیسەیان وت ئازادی بکە، بەلاّم خوای گەورە دڵی ڕەق کرد، ئەگەرنا بیست ساڵ حوکم ئەدراو لە زیندان ئەی نالاّند، هەر خوا گیان خۆی ئەزانێت (و عسى ان تكرهوا شيئاً وهو خيرٌ لكم وعسى ان تحبوا شيئاً وهوشرٌ لكم والله يعلمُ وأنتم لا تعلمون) (البقرە: : ٢١٦) بەڕاستی ئێمە نازانین خێر لەچ دایە؟ ئەکەن بێ تاقەت بن، ئەمە میهرەبانی خوای گەورەیەو بەلاّی گەورەی گێڕاوەتەوە.

با پەند وەرگرین...

یەکەم: ئەبێ بزانین هەموو کارێکی خوای گەورە پڕە لە حیکمەت، چونکە یەکێ لەناوە جوانەکانی(حکیم)ە.

دووەم: هەرچییەکت بەسەر هات، بیدە دەست پەروەردگار، بڵێ خوایەگیان بەڵای گەورەم بۆ بگێڕەوە.

سێ یەم: دڵگران مەبە بەوەی بەسەرت هات، چونکە نازانیت چەندە رەحمەتو بەرەکەتی تێدایەو چەندە خێری بۆت هەیە، حەزرەتی یوسف(سەلامی خوای لێ بێ) حەوت ساڵان گیرا کەئازادبوو بووبە مەلیك، ٧ساڵ گیران کردی بە پاشا، (انالله واناالیه راجعون ) بڵێو بیدە دەست رب العلمین. ئازیزان پەندوو ئامۆژگاری تر بۆخۆتان جێ دێڵم.

**السلام علیکم ورحمة الله وبرکاتهُ**

## ٢٦

# ڕۆژان ڕۆژی لەدوایە

بسم الله الرحمن الرحيم

ئازیزان...

ئینسان زۆر جار تووشی کێشەو گرفتێك دێت، تووشی سزایەك دێت نازانێو بیرناکاتەوە لە مەو بەر گوناهێکی کردووە، ئەمە ئێستا ئینتقامی لێ ئەکاتەوە، زۆر بەمان نازانین کە هەڵەی پێشوومانەو ئەبێ باجی بدەین، ئبین و سیرین ( رەحمەتی خوای لێ بێ ) لە کۆتایی تەمەنی زۆر هەژار بوو، زۆر دەستی کورت بوو، بەکورەکەی وت: رۆڵە ئەم هەژاریەو دەست کورتییەم، هی گوناهێکە ٤٠ ساڵ لەمەوبەر کردوومەو ئەبێ باجەکەی بدەم، ئازیزانم لەگەڵم بن بۆ ئەم چیرۆکە...

کورێکی گەنج ئەبێت، ئیشی قەسابییە، هەموو رۆژ نوێژی بەیانییان دوو مەڕ سەر ئەبڕێتو شەریکەکەی دێتو ئەیباتە دوکان بۆ فرۆشتنو

ئەمیش ئەڕواتەوە ماڵ نانی بەیانی بخوات ئینجا ئەگەڕێتەوە دوکان ئەمە لە شاری ( موصل ) ڕوویداوە، کوڕە گەنجێکی بالا بەرزورێكو جوانە، رۆژێك دەگەڕێتەوە ماڵ بە کۆڵانەکاندا ئەڕوات، هێشتا رۆژ هەڵنەهاتووە کاتێ بە کۆڵانەکاندا ئەڕوات، ئینجا کۆڵانەکانی ئەوان زۆر تەسکن‌و خانووەکانی دووقاتن‌و پەنجەرەی قاتی سەرەوەیان لە دەرەوەیە، لە یەکێ لەکۆڵانەکان پیاوێك هاوار ئەکات‌و ئەڵێ فریام کەون... ئەمیش بەرەو دەرگاکەئەچێ‌و پیاوێکی قەڵەوی گەورە، بەرەو ڕووی دێت‌و خۆی ئەکاتە باوەشی‌و بەرئەبێتەوە، کوڕەکەش بەسەریدا بەرئەبێتەوە ئەم چەقۆیانەی کەپێیەتی هی قەسابیەکەیەتی بەسەر سکی کابرادانەکەون کە هەڵئەسێتەوە هەموو گیانی خوێنی ئەم کابرایەیە، ئەم پیاوە بەچەقۆ لێی دراوە، چەقۆکانی قەسابەکەش گشتی بەخوێنی ئەو ئەبن، کەکوڕەکە ئەیەوێت هەڵسێتەوە پۆلیس دێن‌و ئەڵێن نەجولێی، دراوسێکانیش لەگەڵ هاواری پیاوەکە هاتنە دەرەوە، ئەبینن ئەم گەنجە بەسەر ئەم پیاوە بەربۆتەوەو هەموو گیانیان خوێنە، ڕاست ئەیبەن بۆ بنکەی پۆلیس‌و لەوێشەوە بۆ دادگا، ئەڵێن: ئەم گەنجە پیاوێکی کوشتووە، ئەوەتا چەقۆکەی‌و هەموو گیانی خوێنی ئەم پیاوەیە کەکوژراوە دراوسێکانیش بینیویانەو دوو پۆلیس کەگرتوویانە ئەوانیش بینیویانە، لەدادگا حوکمی لە سێدارەی بۆ دەرئەچێت، هەرچەندە پارێزەر ئەگرێت، بەڵگەیەکی نییە تارزگاری بێت، حوکمی لە سێدارەدانی بۆ دەرئەکەن، شەوی کۆتایی لەناو خزم‌و کەسانی دائەنیشێ‌و قسەیان لەگەڵ ئەکات پێیان ئەڵێ: بەخوا من ئەم کوشتووە،

بەلام قەتلێکی ترم کردووە بابۆتانی بگێرمەوە: (١٠) ساڵ بەر لە ئێستا، پردی پەرینەوە لەسەر رووبارو ئاوەکان نەبوو، خەڵك بەبەلەم ئەپەرینەوە، منیش ئەم ئیشەم ئەکرد هەموو پێنج شەممەیەك کچێکی گەنج لەگەڵ دایکێکی پیر لەم بەر ئەپەرینەوە بۆ ئەوبەر، بەیانییان ئەچوون ئێواران ئەگەڕانەوە منیش سەیری کچەم ئەکردو ئەویش سەیری ئەکردمەوەو یەکترمان خۆش ویست، هەموو پێنج شەممەیەك چاوەڕێیانم ئەکرد لەگەڵ دایکە پیرەکەی ئەهاتن، رۆژێك کچەکە بە گوێی چرپاندمو وتی: خوازبێنیم هاتووە ئەگەر نەیێت باوکم بەشووم ئەدات، کوڕەش لە ماڵ باس ئەکاتو باوکی ئەڵێت ئێمە ئەو پارەیەمان نییە، ئەگەر تۆ دینارێك نەهێنیتەوە، ئێمەنیمانە زۆر حاڵی خراپ بوو، هەفتەیەکی تر دیسان کچە هاتەوەو دووبارە پێی ووتم منیش زۆرم بە ماڵەوە وت بەلام رازی نەبوون، پێیان وتم ئێمە چۆن بیهێنین؟ لە کوێی نیشتە جێ بکەین؟ هەرچی کردم رازی نەبوون، پێنج شەممە چاوەڕێم کرد کچە نەهاتەوە، دوای ساڵێ بینیم ئافرەتێکی گەنج منالێکی لە باوەش دایە هاتنو سواری بەلەمەکەبوون، سەیرم کرد ئەم کچەیە، منیش ئەم هێشت کەسی تر سواری بەلەمەکەبێتو رۆیشتم چاکیو چۆنیم لەگەڵ کردو وتم: بۆنەوەستایت تامن دێم؟ ئافرەتەکەش وتی: دووجار پێم وتی نەهاتی، باوکیشم بەشووی دام، قسەیەك لەمنو یەك لەو بوویە رکابەریانو پێم وت: ئێستادەبێ کاری خراپم لەگەڵ بکەیت، ئەمیش وتی من نایکەم مێردو منالم هەیە ئەمە گوناهەو نایکەم زۆر تەهدیدم کرد، بەلام هەر رازی نەبوو، سەری

منالەکەم ئەبردە ناو ئاوو دەرم ئەهێنا هاواری ئەکرد تامنالەکە خنکا، بەلام هەر رازی نەبوو، دووچەقۆم لێدا چەقۆی سێیەم بەسەر دلی کەوت‌و مرد منیش فرێمدا ناو ئاوەکە بەلەمەکەم شووشت‌و گەرامەوە ئەوبەری ئاوەکەو ئێستاشی لەگەلدابێت کەس نەیزانی ئەم منالو ئافرەتە چییان بەسەر هات؟! ئەم پیاوە من ئەم کوشتووە، بەلام باجی ئەم تاوانەیە کەئەیدەم. جا بەراستی ئازیزان خوای گەورە ئینتقام لە هەر زالمێك وەر ئەگرێ، ( ولو بعد حتی حین ) بائێستاش هیچ کەس ئاگادار نەبێ، بەلام خودا ئاگای لێیە کەتۆ ئەم گوناهەت کردوو رۆژێك ئاشکرا ئەبێ. با پەند وەرگرین ئازیزان:-

یەکەم: ئەوکەسەی کە گوناه ئەکات ئەبێ بزانێت ( ان الله یسمعُ ویری ) خوای گەورە لە ئاسمان سەیرت ئەکات کە گرتی رزگارت نابێ.

دووەم: ئازیزان نابێ ئافرەت بەتەنها بێت لە رێگاو چوونە دەرەوەو نێو تەکسی، خۆشەویستان بەتەنیا سوار بوونی تەکسی حەرامە راستە ئەلێن خەلك ئەبینێ، بەلام خۆ نازانن چی ئەلێن؟ وریابن تاکەرامەت‌و شەرەفتان سەلامەت بێت.

سێ یەم: دایکان‌و خوشکان‌و ئازیزان گەر گەنجێ ئیشارەتی پێدای وەلامی مەدەوە، بزانن ئەم ئافرەتە خەتای خۆی بوو، ئەگەر زوو رووی نەدابایێ‌و قەبوولی نەکردبا، نەشی ئەکوشت خۆی خۆی بەکوشت دا.

پەندو ئامۆژگاری تر بۆخۆتان جێ دێلم

**السلام علیکم ورحمة الله وبرکاتهُ**

٢٧

# ماره بەجاش

بسم الله الرحمن الرحيم

الحمدلله رب العالمين الصلاة وسلام على حبيبينا محمد (ﷺ) وعلى اله وصحبه أجمعين.

بەرێزان...

سەلام‌و ڕەحمەتی خوای میهرەبان برژێت بەسەرتان، یارەبی خوایە گیان، لە گوناهەکانمان خۆشبیت، یارمەتیمان بدەیت خوایە گیان بمان پارێزی، خوایە گیان شەرەف‌و کەرامەتمان پارێزراو بکەیت، خوایەگیان تاعەت‌و عیبادەتمان قبوڵ بکەیت، خوایە گیان بە فیردەوسی الاعلی، شادمان بکەی، پارێزراوبین لە هەموو پەژارەیەك، خوایە گیان زۆر گوناهمان کردووە، خوایە گیان خۆت ڕەحمان پێ بکەیت‌و خۆشەویستی خۆت‌و پێغەمبەر (ﷺ) بخەیتە دڵ دەروونمان، خوایە گیان منداڵەکانمان

صالّح بکەی و سەرکەوتوویان بکەیت، یاڕەبی شیفای نەخۆشەکانمان بدەی قەرزی قەرزارەکانمان بدەیتەوەو یارمەتیمان بدەیت و بەرەکەت بخەیتە رزقیانەوە، ئەوەی خەم و پەژارەی هەیە یارمەتی بدەیت دەستی میهرەبانی و ڕەحمەتت بڕژێ بەسەریان، خوایە گیان تەبایی بخەیتەناو خێزانەکانمان، ئازیزانم، خۆشەویستانم، زۆر جار ئینسان حالّەتی دەست کورتی و خراپی باری ئەکەوێتەسەر، جا ئەگەر ئەم ئینسانە تەوەکولی بەخوای گەورە خوای بە پشتیوانی خۆی دانا، خوای گەورە یارمەتی ئەدات و بەرامبەر ئەمانەش خوای بالاّ دەست نازو نیعمەتی پێ ئەبەخشێت، ئەگەر سوپاس گوزاری خوای تیانەکەن خەسارەت مەندن ( وأما السائل فلا تنهر) خوای گەورە ئەفەرمووێ ئەوەی دێتە بەر دەرگات زەجری مەکە مەیشکێنەوە، بەشێوازی جوان بەرێی بکەو دڵی مەرەنجێنە، هەر هەژارێك خوای گەورە بە پشتیوانی خۆی بزانێت و هەر دەوڵەمەندێك یارمەتی ئەوانیدا کە دێتە بەر دەرگای خوای گەورە یارمەتی ئەدات.

ئازیزان لەگەڵم بن بۆ ئەم چیرۆکە، بۆ ئەوەی بزانین تاچەند ئەم ئایەتەمان جێ بە جێ کردووە (فاعتبروا ياأولي الابصار) خۆشەویستان... پیاوێکی هەژارو دەست کورت ئەڵێت، چوومە شارێك بۆ هەندێ پێداویستی، بەلاّم قەدەری خوای گەورە پارەم لێ بڕاو پارەم پێ نەما، ناچار ئوتێلم جێهێشت چونکە زۆر بێ پارەبووم و کەسیشم لەشارەکەدانە دەناسی، وتی: تاعەسر زۆر گەرام هیچم دەست نەکەوت، زۆریش برسی بووم، جگەلە ئاو شتێکی

تـر نـەبوو بیخـۆم، عەسـر بـوو پیـاوێکم بینـی قـاتێکی جـوانو ڕێکـی لەبەردابوو، ئاسەواری نیعمەتی خوای گەورەی پێوە دیـاربوو، منـیش وتم ڕەنگە ئەم خوا پێداوە دەوڵەمەند بێت، چوومە پێشەوەو سەلامم لێ کـرد وتم: خاڵەگیان درهەمێکم بەرێ برسیمەو نانی پێ نەکرم کـابرا سـەیرێکی کردمو وتی: بڕۆ هەی نانەجیبی نارەسەن، ئەوەی لە دونیـا ڕقـم لێ یـەتی هەژاروفەقیرن، بەتایبەت ئەوانەی وەکو تۆ سواڵ ئەکـەن، زۆر شـکامەوە، چونکە یەکەم جارم بوو، داوای پارەبکەم دوورکەوتمەوەو لـەدڵی خۆمـەوە، زۆر قسەم پێی ووتو بڕیارمدا پارە لەکەس داوانەکەم، مـەغریب داهـات منیش چوومە مزگەوت تانوێژی عیشاشم کرد لەوێ بووم، ئینجا ڕۆیـشتم تاشوێنێ بدۆزمەوە تیادا بخەوم، چوومە گەڕەکێك زۆر خۆش بوو هـەمووی قەسرو خانووی جوانو ماڵی دەوڵەمەند، من بڕۆمە کـوێ؟؟ سـەیرم کـرد خانوێکی تەواو نەکراو هەبوو ئێرەباشەو ئەم شەو بۆخۆم لێرەئـەبم، خـەوتم هەر سەعاتێکی پێچو، دوو پیاو هاتن وتیـان هەڵسە، منـیش وامزانـی خاوەن خانووە تەواو نەکراوەکەیە، بەلام وتی: برسـیتە منـیش وتم: بـەڵێ، بەدواما وەرە منـیش خـەریك بـوو لـە خۆشـیان بـاڵ بگـرم، منـی بـردە خانوویەکی زۆر خۆشو چووینە ژوورەوە بۆلای پیاوێك سەیرم کردو لێـیو وردبوومەوە، ئەمە پیاوەکەی ئێوارەیە، کە لە بازاڕ بینیم ئەبێ چی لـەمن بوێت؟ ووتی: هێناتان؟ وتیان: بەڵێ، ووتی ببەن ئاسەری بشوات، چووینە گەرماوو سەرم شوشتو قاتێکی جوانیان پێـدام، ئینجـا پیاوەکـە بـانگی

کردمو وتی: من کارێکم پێتە، وتم لە خزمەتدام، وتی: من خێزانەکەم تەلاّق داوەو ئەبێ لەتۆی مارەبکەم تابەیانی، ئینجا تۆ تەلاّقی بدەیتو من مارەی بکەمەوە منیش وتم بەسەرچاو، چوومە ژوورێك مێزێکی لێ بوو سینیەك خواردنی لە سەر بوو، تاتوانیم خواردم کەنانم خوارد زۆر گریام، خۆم بیرکەوتەوە ئەوان لەم نازونیعمەتە، هێشتا لەگەلّ ژنەکەی باش نییە، منیش نانم نییە بیخۆم، ئاگام لەوە نەبوو کە ئافرەتەکە لەپەنجەرەوە سەیر ئەکات، ئافرەتێك هاتەژوورەوەو سەلامی کرد، وتم فەرموو خوشکە خزمەتێکتان هەبوو وتی: خزمەتی چی من خێزانی تۆم تازە لە تۆ مارەبراوم وتم: فەرموو دانیشە، وتی: پێنەچێت تۆ پیاوێکی زۆر باش بیت، کارێکم پێت هەیە، وەرە تەلاّقم مەدە، منیش وتم تەلاّقت نادەم، ئەمرۆ لێرە نانم خوارد، شوێنم نییە تاکو تیایدابژیم چۆن تۆ بەخێوبکەم؟ لە کوێ بژین؟ ئافرەتەکەوتی: لێرە ئەژین لەم مالّە، ئەم مالّە هەمووی هی منەو ئەمە شووی دووەمەو شووی یەکەمم زۆر دەولّەمەندبوو مردو هیچ مندالّم نەبوو، شوورم بەو پیاوە کرد، دووەم جارە ئاوائەکات، تەلاّقم ئەداتو دووبارە مارەم ئەکاتەوە تۆمەردبەو تەلاّقم مەدە، وتم زۆر چاکە بابەیانی بێت، لە مالّ دەری ئەکەین وتی: من ئافرەتێکی لە خواترسمو نامەوێت ئاوا بژیم تابەیانی وەکو دوو هاوسەری خۆش بەخت ژیاین، بەیانی پیاوەکە هات وتی: تەلاّقی بدە تا پارەت پێ بدەم وتم: چی؟ ئەمە خێزانی خۆمەو بەشەرعی خواو پێغەمبەر، چۆن تەلاّقی ئەدەم، پیاوەکە وتی ئەمە چییە

ئافرەت؟ ئافرەتەکە وتی: من ئەمەویت لەگەڵ ئەم پیاوە بـژیمو ئامـەویت لەگەڵ نامەردێکی وەکو تۆ بـژیم، ئەمـە دووەم جـارە والـەمن ئەکـەیتو شەرمەزارم ئەکەیت، کابرا بڕێك خەجاڵەت بوو، ئافرەتەکەوتی: فڕێی بدەنە دەرەوە وتم بوەستێ سەیرکە بزانە من کێم؟ من ئەو هـەژارەم دوێنـێ داوای درهەمێکم لێت کرد، چۆن منت شـکاندەوە، ئەمـە سـزای پـەروەردگارە، ئێستا برۆ هەڵەی خۆت بوو تەکەبوورت کرد.

ئازیزان وریابن مەغرور نەبن، ئەگەر نا سزاتان ئەدرێتەوە ( فـاعتبروا یاأولی الا بصار ) ئەوەندە ئەڵێمو پەندو ئامۆژگاریە کان بۆخۆتـان جێـدە هێڵم. بەخواتان ئەسپێرم .

السلام علیکم

چیرۆکی ٢٨

# چاكە دەرمانە، بۆ نەخۆشانە!

بسم الله الرحمن الرحيم

**الحمد لله رب العالمين الصلاة وسلام على سيدنا محمد (ﷺ) وعلى اله وصحبه أجمعين.**

بەڕێزانو ئازیزان...

ڕەحمەتو میهرەبانی خوای گەورە برژێت بەسەرتانا، ئەی خوای تاكو تەنیا ئەی پەروەردگاری هەموو جیهان دەستی بەندایەتیمان بەرزئەكەینەوە ئەڵێین: **یارحمن یارحیم یاغفورو یاكریم یاحیُ یاقیوم یابدیع السموات والارض یاأرحم الراحمین یاالله یالطیفاً بخلقه، یا علیماً بخلقه، یا خبیراً بخلقه** لە گوناهمان خۆشبیت، پاكمان بكەیتەوە، ئەگەرچی گوناهمان زۆرە، بەلاّم تۆ بەڕەحمی، ڕەحمەتت زۆر ترە خوایە گیان خۆت فەرموو تە( ان رحمتی سبقت غضبی ) خوایە گیان رەحمەتت لە پێش ترە لەسزاو غەزەبت خوایە گیان رەحمان پێبكەیت، دڵمان بەنووری خۆت ڕۆشن بكەیتو دڵێك هەمیشە یادی تۆ بكات، خوایە گیان شیفای نەخۆشمان بدەیتو ئەوی خەمو دەردی هەیە، یارمەتی بدەیت یاأكرم الاكرمین.

زۆر جار یەکێك نەخۆش ئەبێ‌و بێ ئومێدی ئەیگرێت، هیوای نەماوە بەژیان، تەنها گەشبینە بەرەحمەتی خوای گەورە، کەبرژێ بەسەریا، ئەی ئەو کەسانەی نەخۆشن بێزارن لە نەخۆشیەکەتان، یەئس نەتانگرێت، لە رەحمەتی خوا (لاتقنطوا من رحمة الله ) چونکە شافی ئەڵلایە، پێغەمبەر (ﷺ) ئەفەرمووێت:( داوو مرضاکم بالصدقة) ئێوە دەرمانی دەردتان بکەن بەخێرو سەدەقە ئازیزانم زۆر جار کەسێك نەخۆش کەوتووە بەلاّم چاکەی زۆر کردووەو خوای گەورە شیفای داوە، پێغەمبەر (ﷺ) ئەفەرمووێ بەلاّو موسیبەت دێتە خوارەوەو دوعاو پاڕانەوەو چاکە بەسەر ئەکەوێت، ئەگەن بەیەکتر لە ئاسمان، کامیان بەهێزتربێ ئەو سەر ئەکەوێت. کەواتە: تۆ دوعاو چاکە زۆر بکە تابەلاّو موسیبەت نەیەت، ئەم بەلاّیەش کەدێت بەچاکە لەسەرت ئەکەوێت.
لەگەڵم بن بۆ ئەم چیرۆکە:- پیاوێك ئەبێت نەخۆشیەکی زۆر ترسناکی تووش دەبێت، دکتۆر ئەما ئەیکات لە ولاّتەکەی، ئەم پیاوە زۆربەی سامانەکەی سەرف کرد، دەرمانی زۆر گران ئەکرێت، پێیان وت: برۆ ولاّتی دەرەوە، لەوێ رەنگە چارەسەربکرێت، ئەم پیاوەش خۆی ئامادەکردوو ڕۆیشت لەوێ دکتۆرەکان وتیان تۆ چارەسەرت هەیە، بەلاّم ئەبێت نەشتەرگەری بکرێت، هیوای دەرچوونت لەم نەشتەرگەریە لە سەدا بیستە(٢٠/.) ئەمیش وتی: ئەگەر لەسەدا بیستیش بێت هەرباشە، خۆمن هیچ هیوام بەژیان نەماوە، ئەگەر لە ژێر نەشتەرگەریەکە رزگاریشم نەبێ ئەمرم، لەم هەموو نەخۆشی‌و ئازارە بێزاربوومو رزگارم ئەبێ، ئەگەر خوای گەورە لوتفی کردو باشتربووم سوپاس بۆ خوا کەلە رەحمەتی خۆی بێبەشی نەکردم، بەلاّم بابگەرێمەوە ولاّتی خۆم لەوێ گەردەن ئازایی لە کەس‌و خزمان‌و هاورێیان بکەم‌و هەندێ وەسیەت

بکەمو میرات بەش بکـەم، ئینجـا ئەگەڕێمـەوە بۆنەشـتەرگەری، هاتـەوە لای منالْو خزموکەسانی، وتی: نەشتەر گـەری ئـەکرێمو کـێ ئـەڵێ لـە ژێـر ئـەم نەشتەر گەریە دەرئەچم؟ لای ئەوان باسی نەکرد، هیـوای دەرچـوون لـە سـەدا بیستە ئیتر وردە وردە کارەکانی جێ بەجێ کردو سەردانی هاورێکانی ئـەکردو یەکە بە یەکـە گـەردنی پـێ ئازائـەکردن، ئێوارەیـەك ئەگەڕایـەوە مـاڵ وتـی باهەندێ گۆشت بکرمو لەگەڵ خۆم بیبەمەوە بۆماڵ، لای دوکاندارەکەوەستابوو گۆشـت بکـڕێ، بینـی ئافرەتـێ هـاتووەو بەدوکاندارەکـە ئـەڵێ ئێسـکەکانت بۆداناوم؟ پیاوەکەش: ئەڵێ بوەستە دایکی من تاکڕیارەکەم بەرێ بکەم، منیش زۆرم پێ سەیربوو ئەبێ ئێسکی بۆچی بێت؟! لێم پرسی: دایەگیان بۆچی ئێسك ئەکریتو بۆچیتە؟ ئافرەتەکەش ئەڵێ: (٦) منالْم هەیەو باوکییان نییە، پـارەم نییە تاگۆشت بکڕم ئەم ئێسکانە ئەبەم، هەر باشە تـامی گۆشـتی لێ دێـت، کەوای وت زۆرم پێ ناخۆش بوو ئاگر لە جەرگم بەربوو، وتم: دایـەگیان تایـەك مانگی تر هەموو رۆژ وەرە ئێرە کیلۆیەك گۆشت بەرە بۆ منالەکانت بابیخۆن، پارەی (٣٠) کیلۆ گۆشتم دا بەکابرای دوکاندار، بـەلاّم وتم ترخـوا دایکـەگیان دوعای خێرم بۆبکە نەخۆشم تاچاك بەوە گۆشتەکەی خۆم بردەوە ماڵو ئێـوارە دانیشتین تاشیو بخۆین یەکێ لەمنالەکانم وتی: باوکـە ئـەڵێی ئـەمرۆ ڕەنـگو رووت خۆشترەو باشتری؟ وتم: ناڕۆڵەگیان ئەمڕۆ زۆر ماندوو نەبووم بۆیە ڕەنگم باشـترە، رۆژ بـە رۆژ باشـترئەبوومو ئـانم بـۆ ئـەخورا، بـەلاّم وتم بـابڕۆم نەشتەرگەریەکە بکەم، ئیتر لوتفی پەروەردگار بـەلکوباش بم چـوویەوە ولاّتـی دەرەوە بەر لەوەی نەشتەرگەری بکرێـت، پـشکنینی گـشتی بـۆکرا لـە کـاتی پشکنین پێیان وت تۆ نەشتەرگەری کراویت؟ وتم: نەشتەرگەری چـی؟! لـە کـێ

بیکەم؟ وتیان: تۆ نەخۆشیت نەماوە، بزربووە ئەسڵەن شوێنەواریشی دیارنییە زۆر بیرم کردەوە پێم سەیربوو چۆن چاك بوومەتەوە!!! تادوعای ژنە هەژارەکەم بیرکەوتەوە، کەگۆشتەکەم بۆ کڕی بوو، وەچۆن لەدوای ئەم رۆژەوە باشتر بووم، ئیتر زانیم خوای گەورە بەهۆی ئەم خێرە شیفای بۆ ناردووم، وە بەدکتۆرەکانی ئەوێم وت: هەرچەند ئێوە لەسەر ئایینی ئێمەنین، بەلاّم من بۆیە شیفام بۆ هاتووە چونکە ئەو خێرەم کردووە وتیان: ڕاست ئەکەیت، کاریگەری زۆری هەیە چونکە تۆ نەفسییەتت مورتاح ئەبێت، جگە لەمەش خوای گەورە دوعای ئەم ئافرەتەی قەبووڵ کردووە، جا ئازیزانم بەڕاستی شیفای بۆهات لە کاتێك هیچ هیوایەکی بەژیان نەمابوو، ئەمەتەنها شتێکی بچووکی بۆکرد، ئەی ئەگەر بڕۆیت ماڵەکەیان بۆ ئاوەدان بکەیتەوەو یارمەتییان بدەی؟ دڵیان خۆش بکەیت؟ ئازیزان سەیری ئەم خێزانە بکەن، خوای گەورە لە یادمان ناکات. با پەند وەرگرین...

یەکەم: شیفا بەدەستی پەروەردگارە ( واذا مرضت فهو یشفین ) ئەگەر نەخۆش بکەویت، هەر ئەو شیفات ئەدات، ئەمە حەزرەتی ئیبراهیم ئەفەرمووێت، خوا لە قورئان باسی ئەکات، هەروەها پێغەمبەر (ﷺ) ئەفەرمووێت (داو مرضاکم بالصدقة) خێرو چاکە بکەن شیفاتان بۆ دێت.

دووەم: ئەم هەژارانە بەسەر بکەنەوەو یارمەتییان بدەن، چونکە خوای گەورە تاقیتان ئەکاتەوە بەم ماڵو سامانەی کە لە بەردەستتانە.

**السلام علیکم ورحمة الله وبرکاتهُ**

چیرۆکی ٢٩

# رەزەیلی

بسم الله الرحمن الرحیم

**الحمدلله رب العالمین. الصلاة والسلام علی حبیبنا محمد (ﷺ) وعلی اله وصحبه أجمعین.**

بەرێزان...

ڕەحمەتو میهرەبانی خوای گەورە برژێ بەسەردڵو دەروونتانا خوایە گیان لێت ئەپارێمەوە بە ناوە جوانەکانت بە میهرەبانیت بە ئیسمی (أعظم)ت **یارحمن یارحیم یاغفور یاکریم یاحی یاقیوم یابدیع السموات والارض** یارەبی لە گوناهمان خۆش بیت، لە خەمو پەژارە دوورمان بخەیت، لە زوڵمو زۆر داری بمان پارێزی، خوایە گیان دڵە کانمان بە نووری خۆت منەوەر بکەیت، دڵێکی زیندوو وریاو ئاگادارمان بەقسمەت بکەیت، یارەبی خوایە بەلوتفی خۆت لەگەڵمان بکەیت، خوایە گیان بەوە داوات لێ

ئەکەین کە پێغەمبەر (ﷺ) داوای لێ کردووی، خۆمان ئەپارێزین هەروەکو پێغەمبەر(ﷺ) خۆی لێ پاراستووە، یاأرحم أرحمین، یا ألله خۆشەویستان ئەم سەروەتو ماڵەی هەمانە، هەمووی هی پەروەردگارەو ئێمەی کردووە بەسەپان لەسەر ئەم سەروەتە، سەیرمان ئەکات بزانێن کامان سەرکارو سەپانی ئەمینو رێکین چۆن ئەبەخشین یان ڕەزیلین بۆماڵو منال سەرفی ناکەین.

ئازیزان: ڕەزیلی دوو جۆرە، جۆرێکیان ڕەزیلەو بۆخۆی سەرفی ناکا، دووەمیان جگەلەوە فەرمانیش بەڕەزیلی ئەکاو بلاوی ئەکاتەوە، (الذین یبخلون ویأمرون الناس بالبخل ) خوای گەورە ئەفەرمووێ هەندێك هەن ڕەزیلن بەلام هەندێکی تر هەن فەرمان بەخەلکی تردەکەن ڕەزیل بن، ئەمەزۆر خراپە ماڵی دونیاهی ئەوەنییە ڕەزیلی بۆبکەی ( انفق أنفق علیك ) بیبەخشە خوای گەورە پێتی ئەداتەوە، ئەڵێن پیاوێك هەبوو زۆری ئەبەخشی، وتیان تۆ ئەوەندە ئەبەخشی ناترسی لە هەژاری وتی نەخێر من فێربووم ببەخشم لەوەی وەستاکاتێك دیوار دروست دەکات، کرێکاریش خشتی پێ ئەدات تایەکێك ئەکات بەدیوار، خشتێکی تری پێ نادات، من لەوە فێربووم کەتامن ئەوەی بەردەستم سەرف نەکەم، خوا گیان هی ترم پێ نادات، ئازیزان با پەندوەرگرین: پیاوێکی هەژارو دەست کورت هەبوو کەس نەبوو بیبات بۆ ئیشو زۆر داماوو هەژاربوو، رۆژێك هاورێیەکی بینی پێی وت چۆنی؟ وتی زۆر خراپم، دایكو باوکم لە ماڵ لێم بێزارن ئەم نانەی لە ماڵ ئەخۆم شەرمەزارم، چونکە هیچ ئیشم نییە، هاورێیەکەشم

وتی: ئاوا بێزاری؟! وتی بەڵێ زۆر دەست بەتاڵم، وتوویانە شەڕ لە دەست بەتاڵی باشترە، چونکە دەست بەتاڵی کێشەی زۆری لێ ئەبێ، ئیمامی عومەر( رەزای خوای لێ بێ) دەڵێت کەسێك ببینم خۆشم بووێت، کە ئەپرسم ئیشت چی یە؟! گەر بلێ بێ ئیشم، لە خۆمەوە خۆشم ناوێت، ئازیزان: رێزی مرۆڤ لە کارو کاسبیەکەیەتی، ئەم پیاوە هاورێیەکەی پێی وت وەرە لای من کاربکە لە کارگەی بلۆك‌و خشت دروست کردن، وتی باشە، چوو، لەوێ پارەی کۆدەکردەوە، بەڵام زۆر ڕەزیل بوو، هیچ پارەی نەدەدایە ماڵ، وای لێ هات ئۆتۆبیلێکی بار هەڵگڕی کڕی، بەنیوەیی لەگەڵ هاورێیەکەی، ئەم جارە پارەی کۆکردەوە سەرفی نەکرد، ئۆتۆمبیلەکە بوو بەهی خۆی، فرۆشتی کارگەیەکی پێ کڕی، ئینجا دەستی کردە خیانەت کردن دەوڵەمەندبوو ژنی هێنا ماڵی دانا‌و چوار کارگەی تری پێ کڕی، پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم ) ئەفەرموێت (من غشنا فلیس منا). جارێکیان کابرایەك هاتە کارگە‌و برێکی زۆر خشتی بۆ دروست کردنی بینا برد، تا دواتر ئاپارتمانی کابرا ڕووخا، دوای هێنان‌و بردن‌و کەشف کردن وتیان غەش لە خشتەکەدایە، ئەچم لەکارگە سەیردەکەم، کەرەستەی باش لە خشتەکە ناکرێت ئینجا وتیان چوار ساڵ زیندانی بکرێت یان بڕی(١٥٠٠٠٠)سەدو پەنجاهەزار غرامە بکرێت، ئەمیش دڵی نەئەهات نان بۆ ماڵ‌و منالی بکڕێ، چۆن ئەم هەموو پارە ئەدات، چوار ساڵ زیندانی پێ باشتربوو، لە ئەهامەتی زیندان پالی لێ دایەوە کەهاتەوە، وڵات تووشی شەڕبوو شەڕی عێراق‌و کوێت، ئەو پیاوە

کوێتی بوو ڕای کرد کەهاتەوە بینی هەرچوار کارگەکەی سووتاون و بەتالآن بردراون، لەگەڵ زەوی تەخت بوون، لەخەمان شەلەل گرتی لایەکی مرد، لە ماڵ کەوت، خۆشەویستان سزای کەسێکە ڕەزیلی بکات تەنها خێری بکردایە خوای گەورە دەی پاراست، بیست کارگەی تر هەبوون لەلای کارگەکانی ئەو، خوای گەورە پاراستوونیەتی، چونکە خاوەنەکانیان خێرو چاکەیان ئەکردوو پیاوی چاك بوون ئازیزان چوار ساڵ زیندانی کرا، تەمەنەکەی زۆر درێژنەبوو، چووە سعودیا کە گەڕایەوە هەمووی ڕووخابوو، ئازیزان: با ئەو ماڵەی هەمانە بیدەینە دەست خوای گەورە ( وما تنفقوا خَيْرٍ فِلاَ نفُسكُمْ ) خوای گەورە بۆخۆی دەفەرموێت ئەوانەی دەبەخشن بۆخۆتانەو بۆ ئەوەی بێتەوە سەر رێتان با پەند وەرگرین:-

١- ( فأعْتَبِرُوا يأولي الأبْصار ) پەند وەرگرن ئەوانەی چاوی دڵتان هەیە، پەندوەرگرن لە هەرشتێ دەیبیستن و دەیبینن

٢- ئەوەی لاتانە هی خۆتان نییە هی پەروەردگارە بەهەشتی پێ بکرن و ڕەزابوونی خوای پێ بکرن،

٣-هەموو حاڵێك دەگۆڕێ ( كل حال يزول ) هەموو بارێك دەگۆڕێ و گۆڕانی بەسەردادێ، تەنها خوای گەورە وەکو خۆی دەبێت.

هیوادارم ئەم زنجیرە باسەی کردوومانە سوودتان لێ وەرگرتبێت تاباسی تر بەخواتان دەسپێرم . السلام عليكم ورحمة الله وبركاتهُ

**کۆتایی...**

# پێرستی چیرۆکەکان

هەردەم لە چاوەڕوانی بەرهەمی نوێ دابن.




دونیا قوتابخانەی ژیانە، دونیا جێی تیارامانەو جێ ی تاقیکردنەوەی ژیانە، دونیاو بەرزیۍ و نزمی خەلکی خۆشی و شادی خەلکی هەمووی جێی پەند وەرگرتنە، بۆ پەند وەرنەگرم لە خۆشی خەلکی، لەبەرزی خەلکی بۆ پەند وەرنەگرم، لەبێ دەسەلاتی خەلکی، بۆ پەند وەرنەگرم لە زالم و زۆردارەکان بۆ پەند وەرنەگرم، لە هەژاران ، لەدەولەمەندان، بۆ پەند وەرنەگرم لە بێ نەوایان، لە نەخۆشەکان، گەیشتمە ئەو قەناعەتەی کە دەبێ ئینسانی موسلمان پەند وەرگرێ لە هەموو ژیان هیچ تاقیکردنەوەیەك نەروا لە ژیانت، تا پەندێکی لی وەرنەگرێت

بلاوکراوەی کتێبخانەی

حاجی قادری کۆیی

بۆ فرۆشتن و چاپکردن و بلاوکردنەوە

٠٦٦ ٢٢٣٣٨٦٨

عێراق – کوردستان – هەولێر